پرۆژەی بیری میانڕەو (٦٦)

# ژوورە سپییەکەم

نووسینی:

هەژار سەلام

پێداچوونەوەی:

قانع خورشید

ناوی کتێب: ژووره سپییەکەم

بابەت: ئەدەبی- نۆڤلێت

نووسەر: هەژار سەلام (١٩٩٩ز-    )

پێداچوونەوە: قانع خورشید

دیزاینی بەرگ: ڕەها حەسەن

دیزاینی ناوەوە: هاوسانی

بڵاوکار: ڕێکخراوی هاوسانی و ناوەندی ڕێنوێن

نۆبەتی چاپ: یەکەم (٢٠٢١)

چاپ: ناوەندی ڕێنوێن

تیراژ: (٥٠٠) دانە

نرخ: (٤٠٠٠) دینار

ئەندازەی لاپەڕە: (١٩,٥×١٢) سم

ژمارەی لاپەڕە: (١٦١)

ژپنک (ISBN): ٩٧٨-٩٩٢٢-٦٤٦-٦٠-٢

له بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان، ژمارەی سپاردنی (١٦١٠)ی ساڵی (٢٠٢١)ی پێ دراوە.

# ناوەڕۆک

**پێشەکی:**

"ژیان زۆردار و دڵڕەقە، بەڵام زۆر جوانیشە."

(میکاسا ئاکەرمان)

ســـەیر کە، دەزانم من وەک تاوانبار دەبینیت، ئەگەر گوێم بۆ ناگریت تا کۆتایی، تکایە گوێ مەگرە چونکە دەزانم ئەگەر تا کۆتـایی گوێم بۆ نەگریـت، مـن وەک دێوەزمەیەک دێمە بەرچاوت. ناحەقیشت ناگرم، خۆ هەموو ئەوانەی باسی دەکەم پەنجەی تاوان بۆ من ڕادەکێشـــن، من ١٥ ســاڵ بووم، ١٥! لە ژیانی خۆمدا هیچ شـــتێکی هەڵەم ئەنجام نەدابوو، لەوانەیە تاکە شـــتێک هەڵەم کردبێت ئەوە بووە کە زیاتر بە قەڵەمە ڕەشەکە دەمنووسی نەک شینەکە و مافی شینەکەم دەخوارد. بەڵام ئەو کاتەی بووم بە پۆلی ١٠ ی ناوەندی و مەکتەبەکەم گۆڕی، هەموو شتێک گۆڕا.

لە مەکتەبە تـازەکەم کۆمەڵێـک برادەری تـازەم نـاســـی، کۆمەڵێک خەڵکی نوێ و بیرۆکەی نوێ هـاتنە نـاو ژیـانمەوە، من پێشـــتر کەســـێکی زۆر زیرەک بووم و ڕۆژانە واجبەکانی خۆمم دەکرد، ناڵێم یەکەمی پۆلەکە بووم، بەڵام هەمیشـــە لە یەکەمەکـان بووم و تەلەبەیەکی زیرەک بووم. بەڵام لەگەڵ

ناســـینی ئەو برادەرە تازانە شـــتەکان گۆڕان، ناڵێم خراپ و ناخۆش بوون، خۆش بوون، بەڵام منیان گەیاندە ئەم ڕۆژەی ئەوەتا لە زیندانەوە ئەم چیرۆکە دەنووسمەوە بۆ ئەوەی هیچ کەســێک هەمان ڕێگەی من گرتم، نەگرێتە بەر و تووشـــی هەمان هەڵە نەبێتەوە.

لەگەڵ ناســینی هەندێک کوڕدا لە مەکتەبەکەم، دونیای من گۆڕا، کوڕێک کە ٢ ســاڵ لە خۆم گەورەتر بوو و دەیگوت کە بە ٧ ســاڵی چووە بۆ مەکتەب و ســاڵێکیش ماوەتەوە بوو بە نزیکترین برادەرم، کۆدۆ کە نـاوی ئەو کورە بوو ببووە جێگەی متمانەی تەواوەتیی من، هەر لە پۆلیش لە تەنیشـــت یەک دادەنیشتین و لەناو دەرس و شت زۆر قسـەی نەدەکرد. بەڵام هەر لەگەڵ زەنگی پشووەکان لێی دەدا دەستی بە قسـە دەکرد و پرسـیاری زۆری لێ دەکردم. ئینجا ئەو برادەری زۆر بوو، بۆیە زۆربەی کـات ئەو شـــوێنەی من و کۆدۆ زۆر قەرەباڵغ دەبوو لە پۆلەکە. هەریەکەیان باسی دنیای خۆیانیان دەکرد کە چۆن ژیانیان بەڕێ دەکەن و خەریکی چین. ئەوەی من ســەرنجم دابوو کەس باســی خوێندن و شــتی نەدەکرد، هەمووی باســـی ئەوەی دەکرد چەند کچ فۆلۆوی کردووە و چەند ســـناپی کچانی لایە و ســـتریکی لەگەڵ چەند دانەیان هەیە. دوای چەنـد مـانگێـک من بیرکردنەوەکـانم بەتەواوەتی گۆڕابوون، هەستم دەکرد کاتێک ئەوان باسـی ئەو شـتانەیان

دەکرد من بە دەمیانەوە پێدەکەنیم و هەستم بە کەمی دەکرد کە منیش هەمان کار ناکەم، لە خۆمم دەپرسی، یەعنی من بێ توانام؟ یەعنی من ناتوانم سناپی کچێکم لا بێت، ها؟

بۆیە ڕۆژێک کە لەگەڵ کۆدۆ دەڕۆشتینەوە ماڵەوە، وتم: «ئەرێ کاکە مێشکتان بردم بەم باسکردنی سناپ و فۆلۆوانەتان، دە یەک دوو دانەم دەیە منیش فۆلۆویان بکەم و سناپەکانیان ببینم.» کۆدۆش پێکەنی، وتی: «کاکە ئەم شتانە بۆ تۆ نابن، تۆ خەریکی سەعییەکەو بە»، وتم: «نا منیش دەمەوێ هەندێک چیرۆکم هەبێ لەناو پۆل لەگەڵ کوڕەکانا باسی کەم. چییە حەسوودیت پێدێ بە یەک دوانێکم بناسێنیت؟» کە ئەو ڕۆژەم بە بیر دێتەوە قێز لەو قسەکردنەی خۆم دەکەمەوە، چونکە ئەوکات وەک ئەوەی کچ شتێک بێت ئەموت یەک دوانێک، وەک ئەوەی ئەوان مرۆڤ نەبن و کاڵایەک بن کە ئەو یەک دوانێکم پشان بدات. وتی: «باشە باش، تۆش ئەوەندە جددی مەبە، خۆم بچمەوە گرووپێکی سناپ لەگەڵ دوو دانەیا دروست دەکەم بۆت» وتم: «ئێهە بتبینم کۆدۆ، بزانم چیم بۆ دەکەی!»

کە چووینەوە ماڵەوە، لە عەسرەوە من چاوەڕێ بووم، هەر سناپەکەمم دەکردەوە و هیچ نەهاتبوو، سەرێکم لە ئینستاگرام و فەیسبووک دەدا، دووبارە دەهاتمەوە سناپ، خۆم لەناو سێرچی ئینستاگرامەکەما دەبینییەوە و چەندین سەعات کات

ڕۆشتبوو. تا شەو کە کاتی خەوم هات، سەعات ١١ی شەو کۆدۆ گرووپەکەی دانا و وتی: «چۆنن جەماعەت؟»، من ئەو کاتە ئەبوایە بخەوم، لەناکاو تەزوویەک بە گیانما هات و بیرم کەوتەوە بۆ یەکەم جارە ئەمڕۆ من دەستم لە کتێب نەداوە. ئەی هاوار! سبەی چی جوابی مامۆستا بدەمەوە؟ بەس ئەو بیرۆکەیە زوو لەناو مێشکم بزر بوو کاتێک لە چاتەکە کۆدۆم بینی نوسیبووی: «کچینە ئەمە توانای برادەری خۆمە. کوڕێکی تا بڵێی باشە، یەکەمی پۆلەکەی خۆمانە جەماعەت.» هەردوو کچەکە نوسیبوویان خۆشحاڵ بووین، من نەمدەزانی بڵێم چی یەکەم جارم بوو قسە لە گرووپێکی وادا بکەم، نووسیم: «زۆر سوپاستان دەکەم، منیش خۆشحاڵم. من توانام و لەگەڵ کۆدۆ پۆلی ١٠ین.» وتیان «ئێمەش پۆلی ١٠ین.» کۆدۆ وتی: «ئەم برادەرە ژیانی هەر سەعی و شت بووە کچینە، ئیتر خاترێکی بگرن.» منیش نەمدەزانی بڵێم چی و لە قسەکەی کۆدۆش تێنەدەگەشتم، بەڵام بۆ ئەوەی وا دەریخەم منیش لە خۆیانم، چەند ئیمۆجییەکی پێکەنینم نارد.

لەو شەوەوە ئیتر من کاتی خەوەکەمم لە دەست دا، پێشتر بەیانیان سەعات ٦:٣٠ بەخەبەر بووم و نانم دەخوارد و زوو دەڕۆشتم بۆ مەکتەب، لەو شەوەوە من شەوانە لە گرووپەکە قسەم دەکرد لەگەڵیان و زۆر درەنگتر لە جاران دەنووستم، بەیانیان ٧:٣٠ بەخەبەر دەهاتم و بە قەلبێکی قورسەوە

دەچووم بۆ مەکتەب. لەبەر ئەوەی خەوەکەم زۆر ناڕێک بوو، دوای مەکتەبیش هەر هەســـتم بە ماندوێتی دەکرد و دەبوایە بخەوم، کە ئێواران هەڵدەســـتام، مێشــکم هەر لای ئەوە بوو ئەمشـــەو لە گرووپەکە چی بڵێم و باســی چی دەکرێ، منیش قســـەی تێدا بکەم. بۆیە وردە وردە لە دەرســـەکانم دوور دەکەوتمەوە و ســـەعیم کەمتر و کەمتر دەکرد، ئەوەندەشـــی دەمخوێند بە تەرکیزەوە نەبوو و مێشـــکم لە لایەکی تر بوو. دوای هەفتەیەک لە گرووپەکە، شـەوێک کۆدۆ ستریکێکی نارد لە ژوورەکەی خۆی و وتی: «یەڵا ســـەرو ســـتریکێک بکەن با ژوورەکانیشـــتان دیار بێت، بزانین ژووری کاممان جوانترە!» هەر زوو دوو کچەکەش ســـتریکی ژوورەکانیان کرد و زۆر زۆر لام ســـەیر بوو کە هەروا بە ئاســانی وێنەی خۆیان ناردە گرووپەکە، ئاخر من تەنیا یەک هەفتەیە دەیانناسم.

لێزان و شـــێنێ، دوو ناو بوون کە بەردەوام لەگەڵ کۆدۆدا لە خەیاڵم بوون، بەیەکەوە بەتەنیا لەگەڵ کۆدۆ هەر باســـم دەکردن، ئەمویســـت بزانم چۆنن و چی دەکەن و چی ناکەن. ئەو شـــەوە کە بینیمن، هەســـتێکی زۆر زۆر خۆشـــم هەبوو، یەکەم جارم بوو هەستی وام بۆ دروست بێت. هەردوکیان دوو کچی زۆر جوان و ڕێک و پێک بوون، ژوورەکانیان جوان و ڕێکخراو و خـاوێن بوون، لە وێنەکەی هەردووکیشـــیـانـدا کتێبخانە دەرچووبوو. وتم: واو، ئەمانە ئەشـــخوێننەوە! کات

هـات و ڕۆشــــت، شــەوان ســـتریـک زیـادی کردبوو لە گرووپەکەمان و من زیاتر هۆگریان دەبووم، تۆ بەیانییە دوای مەکتەب بە کۆدۆم وت، باشــە تۆ شــێنێ و لیزانت بینیوە لە نزیکەوە برا؟ وتی: ئەی چۆۆن، ئەم هەفتەیەی دابێ دووبارە کۆبوونەوەمان هەیە، ئەچینە هۆڵێک بەس تەمەنی خۆمانین هالۆوین و شت ئەکرێ و جلی سـەیر سـەیر لەبەر دەکەین و لەوێ کۆ دەبینەوە، بۆ تۆش نایەی؟

وتم: ها؟ هالۆوینی چی؟ بۆ لێرەش ئەم شتانە هەیە؟

وتی: ئا ئا حەیفت نەکرد ئەمە سێیەم ساڵە ئەکرێ هەر سێ ساڵیش برات لەوێ بووە

وتم: چۆنە؟ چی دەکەن؟

وتی: بەخوا توانـا گیـان خۆو ئەزانی من هیـچـت لێ ناشارمەوە، سەرەتا یەکەم ساڵ، ئەها تاقە کچێکیش چییە لێی نەبوو، حەفلەیەکی ساردمان کرد، بەڵام ساڵ بە ساڵ خەڵکی زیاتر بۆی دێن و خۆشتر دەبێ. ئەمساڵیش وەک پار شێنێ و لیزانیش دێن. هەر خۆی من پار لەوێ ئەوانم بینی و ناسیمن.

وتم: کورە وەڵا دێم، ئەمە کەیە؟

وتی: پێنجشـەممەی داهاتووە سـەعات ٩ی شـەو دەست پێ دەکات.

وتم: ئۆۆو، یەعنی بە شەو ئەکرێ؟

وتی: ئا ئا، هالۆوین هەر شەوە.

وتم: بە خوا باوەڕ ناکەم ماڵەوە بهێڵن بێم، ئیتر هەوڵی خۆمیان لەگەڵ دەدەم، بزانم چۆن دەبێ.

هەفتەکە ڕۆشت و منیش زۆر زۆر هەوڵم دا لەگەڵ ماڵەوە تا ڕێگەیان پێدام لەگەڵ کۆدۆ بچم بۆ ئەو ئاهەنگە، بەو مەرجەی سەعات ١١ لە ماڵەوە بم. منیش لە خوایەکم دەویست ڕێگەم بدەن، وتم کاکە هەر ١٠:٣٠ لە ماڵەوەم. کۆدۆ ئەو شەوە سەعات ٨:٣٠ هات بە دوامدا و بەیەکەوە بە سەیارەکەی باوکی ئەو چووین بۆ شوێنەکە، ئەو ناو ناوە سەیارەکەی باوکی دەهێنایە دەرەوە، خۆ ئیجازە و شتیشی نەبوو، بەس ئیتر زۆر سیقەی بە خۆی بوو و ئەیوت کورە برا لەگەڵ سەیاق سەرکەوتووی خۆ گاڵتە نییە.. گەشتینە هۆڵەکە، هۆڵەکە ئەوە نەبوو من چاوەڕێی بووم، من کە ئەیانوت هۆڵ، بە هۆڵی بووکگواستنەوە و شت تێگەشتبووم، بەڵام لە ڕاستیدا شوێنێکی وەک کەلاوە وا بوو کە ڕازاندبوویانەوە و گڵۆپی ڕەنگاوڕەنگ و موکەبەرەی زۆریان لێ دانابوو. لەوێ بۆ یەکەم جار شێنێ و لیزانم بینی و دووبارە وتمەوە کە خۆشحاڵ بووم و ئەوانیش پێدەکەنین.

سەعات بوو بە ١٠ و من ویستم بە کۆدۆ بڵێم با بڕۆین درەنگە، بەڵام شێنێ لێم هاتە پێشەوە و کۆدۆ لەگەڵ لیزان

ڕۆشتن، پێش ئەوەی من هیچ شتێک بە کۆدۆ بڵێم شێنێ هات و وتی: «ئێهە توانا! زیاتر حەزت لە چ کتێبێکە؟»

منیش چونکە یەکەم جارم بوو کچێک قســـەم لەگەڵدا بکا، زۆر دڵم خۆش ببوو، ئاگام لە کات و شت نەما.

شـێنێ بەردەوام لەسـەر یەک پرسـیاری دەکرد و منیش بە دوور و درێژی وەڵامم دەدایەوە و مناقەشـەی کتێب و شـتمان دەکرد. ئەوەی پێم سەیر بوو ئەوە بوو شێنێ زۆر زۆر لەگەڵم کراوە بوو، وەک ئەوەی بڵێی دە سـاڵە برادەرمە، کە قسـەیەکی کۆمیدیمان دەکرد دەسـتی لە شـانم دەدا و قاقای پێکەنینی کات و شـــەوی بیری من بردبۆوە... دوای قســـە و باسـێکی زۆر، هۆڵەکە بەرە بەرە چۆڵ دەبوو، کۆدۆ هـات و وتی: «کـاکە، ئەرێ نەڕۆین؟ درەنگی کردووە بە خوا.»، لیزانیش بـانگی شـێنێی کرد و وتی: «هەسـتە بڕۆین کچی باش! چاک گەرمتان کردووە ئەم دوانەتان.» وتم «بۆ سـەعات چەندە کۆدۆ؟!» وتی: «کاکە ئەوە بوو بە ١٢ و نیوی شــەو، ئەوە بۆ هەڵناســتی؟» وتم «ها؟!» زۆر ترسـام، ئاخر بەڵێنم بە ماڵەوە دابوو بۆ ١٠ و نیو لە مـاڵەوە بم. بەڵام خۆم تێکنەدا بۆ ئەوەی لەبەر چـاوی شێنێ تەریق نەبمەوە، وتم: «ئاا بەڕاست، دەیەڵا با بڕۆین.»

«شێنێ گیان، خۆشحاڵ بووم، شەو شاد.»

کە چوومەوە بـاوکم و خوشـــکە بچوکەکەم خەوتبوون، بەڵام دایکم لە مەتبەخەکە چاوەڕێی دەکردم، وتی: «جەناب بۆ

وەڵامی تەلەفوون نادەیتەوە ها؟ لە کەیەکەوە ئاوا درەنگ دێیتەوە تۆ؟»

وتم: «دایە، بە خوا ئاگام لە کات نەمابوو، ئێ خۆ هەر یەک جارە.» ئیتر بە قسەی خۆش ئاشتم کردەوە.

بەیانی جومعە بوو، لە نیوەڕۆ کە هەستام ڕاست سەیرێکی مۆبایلەکەمم کرد، شێنێ نامەی بۆ خۆم ناردبوو، یەکەم جار بوو لە دەرەوەی گرووپ نامە بنێرێت، نووسیبووی: «چۆنی توانا گیان؟ دوێنێ شەو زۆر خۆش بوو.» دڵێکیشی دانابوو.

منیش وتم: «زۆر سوپاس شێنێ گیان!» دڵێکم بۆ دانایەوە.

ئیتر شەو لە گرووپ قسە دەکرا و من و شێنێش لە دەرەوەی گرووپەکەش قسەمان دەکرد.

کە کاتی ستریک هات ستریکمان نارد بۆ گرووپ و ئەو ستریکێکی نارد تایبەت بۆ من، بەڵام زۆر جیاواز بوو، لەبەر ئاوێنەیەک بوو و جلی خەوەکەی لەبەردا بوو، ئیتر منی ١٥ساڵیش ئەوکاتە لە لوتکەی حەز و ئارەزووی خۆمدا، وتم: با ستریکی زیاتر بنێرین شێنێ! ئیتر چەند دانەیەکی ترمان نارد و هەر جارێک ئەو جوانتر دەردەکەوت و منیش زیاتر حەزم بۆی دەجووڵا. کە ئێستا بیر لە خۆم دەکەمەوە، وەک ئاژەڵێک بیر لە خۆم دەکەمەوە کە داواکردنی ستریکەکان لەو لەبەر ئەوە نەبوو ڕێزی لێ بگرم یان خۆشم بوێ، بەڵکە تەنها

دەمویست جەستەی زیاتر ببینم. ئەو شەوە و ستریکەکانی منیان گەیاند بەو ڕۆژەی لە یەکەمی مەکتەبەکەمەوە بێم لە زیندان چیرۆک بۆ ئێوە بگێڕمەوە.

زیندانەکەی من لە زیندانی ناو فیلمەکان ناچێ، نازانم، پێشتر بینیومە زیندان، هەندێک شیشی ژەنگخواردوو و ژوورێکی سارد و ناخۆشە، بەڵام ئێرە نە ژەنگی لێیە و نە ناخۆشیشە، بەڵام چونکە هەر لەو ژوورەم، ئیتر دەزانم زیندانە ئێرە.

من و شێنێ بۆ چەندین مانگ لە دەرەوەی گرووپەکە قسەمان دەکرد و پرسیارمان لێک دەکرد و ئەو وێنەی خۆی بە سەد شێوە و وەستانی جیاوازەوە هەموو شەوێک بۆ دەناردم، لە ڕاستیدا من چونکە تەلەبەیەکی زیرەک بووم لەو چەند مانگەدا بەردەوام خوێندنەکانی خۆشم دەکرد، بەڵام لەم دواییانەدا زیاتر بیرم لە چات و شێنێ دەکردەوە، خۆشم هەستم بەوە کردبوو کە خەریکە لە خوێندنەکەم دوا دەکەوم. من و شێنێ تەنیا دوو هاوڕێ بووین، بەڵام نازانم هەمیشە هەستێکی سەیر لە مندا هەبوو کە دەمویست وەک خۆشەویستێک مامەڵەی لەگەڵ بکەم و خۆشەویستیشی نەبم، تەنیا هاوڕێی بم، چونکە پێم وا بوو ئەگەر خۆشەویستێکم هەبێت لەناو قەفەزێک دەبەسترێمەوە، بەڵام هاوڕێیەکی وەک خۆشەویست شتێکی خۆش دیار بوو. چونکە حەزم دەکرد کچێک ئەو شتانەم بۆ بکات کە خۆشەویستێک بۆ خۆشەویستەکەی دەکات، دەمویست منیش ئەو هەستانە تاقی بکەمەوە و بیانزانم، چونکە بەردەوام کۆدۆ و هەموو کوڕەکانی تری

پۆلەکە باسیان دەکرد. هەرچۆنێک بێت، قسەکانمان بەردەوام بوو تا نیوەی ساڵ تەواو بوو و زستانیش کۆتایی هات. لە پشووی بەهارە من بەجارێک هەستم بەوە کرد کە ژیانم بەهۆی کۆدۆ و دوو کچە هاوڕێیەکەیەوە -کە شتێکی تازە بوون لە ژیانی مندا- چەند گۆڕاوە. گرنگترینیان کە خۆم هەستم پێ کرد و پێی بێتاقەت بووم دابەزینی نمرەکانم بوو، من لە هەموو ژیانم لە هیچ دەرسێک لە ٩٠ کەمترم نەهێناوە، بەڵام ئەمجارە لە بیرکاری ٧٨م بۆ هاتبۆوە و پێی خەمبار بووم، بەڵام لای ئەوان دەرمنەدەخست، چونکە دەمویست وەک ئەوان بم و گرنگی بە دەرەجە نەدەم، بەڵام شتێک لە ناخی مندا هەبوو جیاواز بوو و بە دەست خۆم نەبوو گرنگیی هەبوو لام.

لەم پشووی بەهارەیەدا گۆڕانکارییەکان بە تەواوەتی زەق بوونەوە، چونکە هەر چوارمان بڕیارمان دابوو کە بیستی سێ واتا ڕۆژێک پێش هاتنی نەورۆز لە کافییەک کۆ ببینەوە و جەوێک بگۆڕین.

لە کاتی پلان دانانەکەوە تا ئەو ڕۆژە هات، من خەریک بوو شێت دەبووم، هەر ڕۆژێکم بە ساڵێک لێ دەڕۆشت و زۆر بەپەرۆش بووم. چونکە ئەو شەوەی هالۆوینم بەبیر دەهاتەوە، دەمویست شێتێ لێم نزیک بێت و بۆنی بەسەرم دا بڕوات، زۆر بە تامەزرۆییەوە دەمویست ئەو هەستە دووبارە

بکەمەوە. ئەو ئێوارەیە من کاتژمێر پێنجی ڕێک لە کافێیەکە بووم، دوای نیو سەعات لیزان هات و دوای تۆزێکیش کۆدۆ و شێنێ یەک لە دوای یەک بەدەر کەوتن. من و لیزان تا هاتنی کۆدۆ و شێنێ قسەیەکی ئەوتۆ نەبوو لە نێوانماندا جگە لە چاکی و چۆنی و چۆنییەتی بەڕێکردنی پشووەکە. هەر کە شێنێ هات، من هەستێکی زۆر خۆش و تایبەتم هەبوو، جلێکی زۆر جوانی لەبەر بوو. ئەو بەردەوام جلی مۆدە و کڵاوێکی ڕەشی کوڕانەی لەبەر بوو، قژی لە ژێر کڵاوەکەوە بەردەدایەوە. ئەو ستایلەشی زۆر سەرنجی منی ڕادەکێشا، ئەو ئێوارەیە زۆر لەگەڵ یەکتری پێکەنین و قسەی خۆشمان کرد، باسی خەڵکیمان دەکرد و مەوقیفە کۆمیدییەکانی مامۆستاکانمان دەگێڕایەوە. دوای نانی ئێوارە من دەمزانی ئێستا دایکم دەست بە تەلەفۆن کردن دەکا و دەڵێ وەرەوە ماڵەوە، بۆیە پێش ئەوەی ئەوە ڕووبدا، نامەیەکم بۆی نارد و وتم دایکە مۆبایلەکەم شەحنی تێدا نەماوە و دەکوژێتەوە، من ئەمشەو درەنگ دێمە ماڵەوە. پێش ئەوەی وەڵامی دایکم ببینمەوە، یەکسەر مۆبایلەکەم کردە فلایت مۆد بۆ ئەوەی نە نامەکەی ببینم و نە بشتوانێ تەلەفۆنم بۆ بکات. شەو هات و بوو بە کاتژمێر ٩، لیزان و کۆدۆ زۆر لە یەک نزیک بوون و زیاتر قسەیان بۆ یەک دەکرد و لەگەڵ یەکتری پێدەکەنین، ئەوەش وای کردبوو من و شێنێ زیاتر لێک نزیک ببینەوە. جا

من ئەو ســـــاتانەم هەرگیز بیر ناچێتەوە، کاتژمێر ٩:٥٤ دەقە بوو کە کۆدۆ و لیزان وتیــان ئێمە دەبێ بەجێتـان بێڵین و کارێکی گرنگمان هەیە. من ئەو کاتە نەمدەزانی مەبەســتیان چییە، بەڵام بۆ ئەوەی خۆم وا دەربخەم کە تێدەگەم و منیش یەکێکم لەوان، بە پێکەنینەوە وتم ئیسراحەتی خۆتان وەرگرن. هیچ بیرم لەوە نەکردەوە کە من شەوی هالۆینەکە بە سەیارەی کۆدۆ ڕۆشــتبوومەوە، ئەمجارە لەگەڵ کێ بچمەوە؟ تاکســی؟ نازانم شــــەو تا دێ درەنگتر دەبێ و من هەرگیز بەم کاتانە بە تەنها لە دەرەوە نەبووم و تاکسیم نەگرتووە.

من و شــێنێ هەر لە کافێکە بووین و قســەمان دەکرد، بەڵام تا دەهات زیاتر خەمی ئەوە لە ناخم گەشــەی دەکرد کە کاتەکە درەنگ بووە و بەڕاستیش دەترسام، بەڵام خۆ نەدەبوو باسی ئەو هەســـتانە بکەم، دەنـا لاواز و وەک تەلەبەیەکی زیرەک دەردەکەوتمەوە لای شــێنێ. ئەو لە من زۆر زۆرزانتر بوو، وتی چییە توانا بیر لە چی دەکەیەوە؟ هەست دەکەم لێرە نیت، نا! وتم: وەڵا بڵێم چی، کۆدۆ ڕۆشتووە، من بەم کاتەی شــەوە چۆن لەگەڵ تاکســـی بچمەوەماڵەوە؟ کە ئەو قســـەیەم کرد، خەندەیەکی ناسک و کچانەی کرد و دەستی لەسەر شانم دانا و وتی، ئەی باشە من بۆ لێرەم گیانەکەم؟ خۆ منیش سەیارەم پێیە! ئەو هەر کە ئەو قسانەی کرد، من چاوم زەق بوونەوە و دڵم تەپە تەپی دەکرد، نازانم ئەو گوێی لێ بووە یان نا، بەڵام

من هەستم دەکرد کە دڵم ئێستا ئێسکەکانی سنگم دەشکێنێت، ئارەقەیەکی ساردم کرد و لە یەک ساتدا سەد پرسیار لە مێشکمدا دروست بوون. باشە ئەو کچە بۆ دەست لەسەر شانم دادەنێ؟ بۆ بە من دەڵێ گیانەکەم؟ کە من ئەو بیرانەم دەکردەوە، دەستی هێنا و دەستێکی گرتم و خەندەیەکی تری کرد، هەناسەم تەنگ بوو و یەک دنیا پرسیاری تر هاتنە مێشکمەوە، ئاخر منیش دەستی بگرمەوە یان نا؟ ئەو کچە بۆ سەیارەی پێیە؟ جارێ تەمەنێکی وای نییە ئەو سەیارەیان چۆن پێی داوە؟ ئەی باشە سواری هەمان سەیارە بم کە ئەو لێی دەخوڕێ؟ ئایا لەگەڵ ئەو بچمەوە؟ باشە حەرام نییە؟ ئەی دەرەجەکانم بۆ وا خراپ بوون؟ دایکم خەوتووە؟ نازانم پرسیارەکان چی بوون، بەڵام ئەوەندە دەزانم زۆر پەیوەندییان بەیەکەوە نەبوو، وەک ئەوە وا بوو لایەکی مێشکم بووبێت بە منداڵێکی ٤ ساڵان و لایەکەی تر بووبێت بە باوکی کە نازانێت پرسیارە سەیر و سەمەرە و تێکەڵەکانی منداڵەکەی وەڵام بداتەوە. بەڵام هیچ کام لەو پرسیار و وەڵامانەی لە مێشکمدا هەبوون لە دەمم نەهاتنە دەرێ، بێ ئەوەی بیری لێ بکەمەوە دەستم لەسەر دەستی دانا و وتم خۆشمەوێی شێنێ.

ئەوکات و ئێستاش نازانم بۆچی وام کرد، بەڵام ئەوەی ڕوویدا، ڕوویدا...

ئەو کاتە زۆر بەخێرایی تێپەڕی، من ئەوەندە دەزانم سوور سـوور ببوومەوە و دڵم خێرا خێرا لێی دەدا، کاتێک بەهۆش خۆم هاتمەوە لەناو سەیارەکەی شێنێ بووم، دەستم لەسەر دەسی بوو و سەیارەکەشی ناوەوەی زۆر خۆش بوو، بیرم نایە زۆر لە دەرەوەی سەیارەکە چۆن بوو، بەڵام بە ناوەوەی دیار بوو کە سەیارەیەکی زۆر مۆدێل بەرز و جوانە، ناوەکەی وەک تاریکیی شـەو ڕەش بوو. بۆ سـاتێک تێڕامام و بیرم کردەوە، منێک کە ئەو کاتانە لەناو جێگا بووم و خەوم بە تـاقیکردنەوە و کویزەوە دەبینی و ڕادەچڵەکیم، بەم ١١ی شەوە چی دەکەم لەناو سەیارەی ئەم کچە؟!

پێم وایە بەهۆی ئەو ڕابردووە پاک و گوێڕایەڵییەی هەمبوو، لەوێ ویژدانم هاواری دەکرد کە بەسـی کەم و واز بێنم، بەڵام سـوودی نەبوو، ئاخر چ کاتێک هاواری ویژدان لە بەرانبەر خەندەی کچێک سـەرکەوتوو بووە تا ئەوەی من دووەم جار بێ؟

شـێنێ وتی: «ها توانا، حەزت لە چ گۆرانییەکە؟ ئێسـتا ئەوبەم پیاسـەیەکت پێ ئەکەم، تا ئێسـتا پیاسـەی واو نەکردبێ»، کە وای دەگوت، هەموو شتێکم بیر چۆوە و بابەتی ویژدان مرد و لە بیرکردنەوەکانمدا جگە لەو قسـانەی ئەو دەیکرد، شـتێکی تر بوونی نەما. لە وەڵامی قسـەکانیدا وتم، «وەڵا شـێنێ گیان، ئەوەی تۆ پێت خۆش بێ منیش پێم

خۆشە.» من مەبەستم لە گۆرانییەکە بوو، بەڵام ئەو نەیهێشت زۆر بە جوانی قسەکەم تەواو بکەم، وتی: «بەڕاست، دەباشە ئەگەر بڵێم پێم خۆشە ئەمشەو نەچییەوە ماڵ و لای خۆم بی دەڵێی چی؟» کە وای وت نەمدەزانی دەبێ وەڵامەکەم چی بێ، ئاخر ئەگەر ڕەتم کردبایەوە هەر لەوێ بە درۆ دەهاتمەوە و دەبوومەوە کوڕە زیرەکە لاوازەکە، وتم: «تۆ چی بڵێی ئەوە خۆشە، ئیتر لەوە خۆشتر نییە کە دەیڵێی.»

ڕاستییەکەی من هەر نەمدەزانی شێنێ باوکی ناوی چییە؟ کێیە و لە کوێ دەژین؟ نەشمدەزانی بۆ کوێم دەبات!

بە گۆرانییە ئینگلیزی و ئیسپانییەکانی ئەوەوە هەر ڕۆشتین و پێش ئەوەی لە شەقامی سەرەکیی ناوشار دەرچین، پێچی کردەوە و چووە ناو ڕیزێک شوقەی هاوشێوەی یەکتری، من دڵنیا بووم لە شـــار دەرنەچووبووین، بەڵام دەکرێ بڵێم لە ڕۆخی شاردا بووین، دوور لە بازاڕ و لە ناوەڕاستی شارەکە، دوور لە ماڵی خۆمان و دوور لە مەکتەبەکەشم. کە گەشتین، وتی: «ئەوەش شوێنەکەمان.»

وتم: «ئێرە ماڵی ئێوەیە شێنێ؟» وتی: «نە بابە، ماڵی ئێمەی چی؟ من باوک و دایکم چوون بۆ ســویســڕا بۆ گەڕان و من تەنیام، ئێرەش پڕۆژەیەکی باوکمە، ئەم شوقانە هەمووی هیی ئێمەن، دەنا ماڵی خۆمان وا لە شـــارەوە دوور نییە.» منیش دەمم کرابۆوە و وتم: «ئا بەڕاست!» بە پێکەنینەوە وتم: «چییە

شـــێنێ دەوڵەمەندیشـــن!» وتی: «ئا ئا، هەمووی لە خزمەتی تۆدایە گیانەکەم.»

ئاخ کە ئێســـتا ئەو کاتانەم بیر دەکەوێتەوە، چەند خۆم بە گەمژە دێتە بەرچاو! ئای چەند گەمژە بووم! ئاخر نازانم ئەقڵی من ئەو کاتانە لە کوێ بوو کە پرســـیارێکی لە خۆی نەکرد تا تووشـــی ئێرە نەبم. چۆن مۆبایلەکەم داخســـت ئاخر، چۆن لەگەڵ کچێکی ئاوا ڕۆشـــتم؟ وەک ئەوەی منی ئەوکات ئەو منەی ئێستا نەبووبێت، نازانم چۆن ئەو کارانەم ئەنجام داوە!

ئیتر چووینە کۆتـا شـــوقەی ئەم پڕۆژەیە و لەوێش بە مەســـعەدەکە چووینە ســـەری ســـەرەوە، وتی توانا من کە دایکموان دەڕۆن هەر لێرە دەمێنمەوە، ژوورێکی زۆر خۆش، مەتبەخ و دوو ژووری نوســـتن و حەمامی تێدا بوو. تا ئێســـتا شـوێنی وا ڕێک و خۆشـم نەبینیبوو، ئاوا بۆنێکی خۆشـی لێ بێت و ئاوا ڕێکخرابێ.

شـێنێ سـویچی سـەیارەکەی فڕێدایە سـەر قەنەفەیەک و چاکەتەکەی خۆی دانـا، زۆر ئـازادانە مـامەڵەی دەکرد، وەک ئەوەی ئێمە چەنـدین ســـاڵ بێ لێرە و بەیەکەوە ژیـابین. گۆرییەکانیشـی دانا و هەر فڕێی دایە ســـەر قەنەفەکە و وتی: «توانا گیان، حساب کە ماڵی خۆتە، من دەچم حەمامێک دەکەم و دێمەوە.»

که ئەو ئەو قسـە و ڕەفتارانەی دەکرد، من سەرم لێ شێوابوو، ئاخر من بەس لە فیلمەکان بینیبووم خەڵک دوای هەموو چوونەدەرەوەیەک حەمامێک بکا و بەو شێوازە مامەڵە بکات، نەمدەزانی چی بکەم و چی بڵێم! نەمدەزانی لە کوێم و شێنێ بەتەمای چییە؟ لە جێی خۆم تاسابووم.

تۆزێک بەر لەوەی شێنێ لە حەمام بێتە دەرەوە، من گوێم لە تەقەی چەند پێڵاوێک بوو کە لە ژوورەکە نزیک دەبوونەوە، جا ئەو ساتانەم ڕێک وەک خۆی بیرە، ڕێک وەک ئەوەی شریتێک بێ و هەرکاتێک بمەوێ بتوانم سەیری بکەمەوە. لەناکاو و بێ هیچ ئاگادارکردنەوەیەک چەند پیاوێک لە دەرگاکەوە هاتنە ژوورەوە و ڕێک لەو کاتەدا، ڕێک لە هەمان ساتی هاتنەژوورەوەی ئەواندا شێنێیش لە حەمام هاتە دەرەوە، من نەمدەزانی چی ڕوودەدات، هەموو ئەوەی بیرمە لەو ساتەدا ئەوەیە کە زۆر دەترسام! بیرم نایە پێشتر وا ترسابم. کە ئاوڕم دایەوە بۆ ئەوەی بزانم شێنێ چی دەکا و ئەوانە کێن، دووبارە حەپەسام، چونکە بینیم شێنێ بێ ئەوەی هیچ جلێکی ئەوتۆی لەبەردا بێ، بە قژێکی تەڕەوە هاوارێکی سەیر دەکا و دەڵێ: «توانا گیان! توانا گیان! خۆزگە وامان نەکردایە، ئێستا چی بکەین!».

من نەمدەزانی بڵێم چی، ئاخر چیمان نەکردایە؟ من بە درێژایی ئەو کاتە لە ناوەڕاستی شوقەکە بە حەپەساوی

دانیشـتبووم و هیچ شـتێکی ئەوتۆم نە وتبوو نە کردبووشـم. بەڵام شـێنێ وا هاواری دەکرد، وەک ئەوەی شـتێک ڕوویدابێ. پیاوەکان لە دوای هاوارەکانییەوە بە توڕەیی و بە جنێودانەوە بەرەو ڕووم هـاتن، نـازانم چەنـد پیـاو بوون، بەڵام دەزانم لە دوو کەس زیاتر بوون. من ویســتم بە ڕێزەوە قســە بکەم، چونکە هیچ بژاردەیەکی ترم لەبەردەست نەبوو، وتم: «فەرموو بەڕێزم چیتان دەوێ؟» پێش ئەوەی بە جوانی قسـەکەم تەواو بکەم، شــتێکی زۆر ڕەق و قورس بەر لوتم کەوت و بەرچاوم بۆ سـاتێ تەڵخ و تاریک بوو و سـەرم بەر فەرشـی شـوقەکە کەوت، لە کەلێنی دەرگـاکەوە بینیم کە ژنێکیش لە دەرەوە بە قاتێکی هاوشــێوەی قاتە ڕەشــەکەی پیاوەکان وەســتاوە و عەینەکێکی ڕەشـیشـی لە چاوە، تەنها لە دوورەوە سـەیرمان دەکات، کۆتا دیمەنی ئەو ســاتە بیرم بێ، دەنگی شـێنێیە کە دەیگوت زۆر بەقووەت لێتدا.

کە چاوم کردەوە لە زیندان بووم و هەســتم دەکرد هەموو ئەوە خەونێکە و ئێستا نا ئێستا خەبەرم دەبێتەوە...

ئەو کاتەی کە بەخەبەر هاتمەوە، کەســێک هاواری دەکرد: «توانا... توانا کێیە؟ با بێت ســەردانیکەری هەیە.» من جارێ چاوم بەتەواوەتی نەکرابۆوە و شــوێنەکەم نەبینیبوو، بەڵام هەر کە بەهۆی دەنگەکەوە چاوم کردەوە، زانیم شــوێنەکە زیندانە و ئەو کەســەی بانگم دەکا پۆلیســە، هەر پێم وا بوو

خەوە، بەڵام لەناو خەوەکەدا بەئاگام، ئەها هەندێک خەو هەیە چونکە زۆر ناخۆش و نەگونجاوە، هەر لەناو خەوەکە دەزانی کە خەوە و ڕاستی نییە.

کە نـاوەکەی خوێنـدمەوە بە دەنگێکی کزەوە وتم: «بەڵێ منم، چی بووە؟ لە کوێم؟» وتی: «تۆ ســـەیری ئەمە نـاکەی! لەسـەر کەتنەکە گیراوە و خۆی لە گێلیش دەدا، هەستە هەتیو سەردانیکەرت هاتوون.»

کە چوومە دەرەوە لە زیندانییەکە، دەمگوت تەواو ئێســتا نا ئێســـتا خەبەرم دەبێتەوە، بەڵام تـا زیاتر لە زیندانەکە دوور دەکەوتمەوە، چاوم ڕوونتر و ڕووناکتر دەبۆوە و شـــتەکان زیاتر لە ڕاستی دەچوون، تا ئەو کاتەی گەشتمە ژوورێکی تر و دایک و باوکم بینی...

دایکم دەگریا و باوکیشـم بە تورەییەوە جنێوی پێ دەدام و ســوور هەڵگەڕابوو، ئەو کاتە وەک ئەوەی لە خەوەکە ڕاپەڕم و یەکێک ئاوم پێدا بکا، لە خەوەکە بەخەبەر هـاتمەوە، بەڵام بۆم دەرکەوت ئەوەی وامدەزانی خەوە ناخۆشـەکانە، ڕاستییە! ئەو کاتە وەک ئەوەی شـتێکی زۆر قورس بەر ســەرم کەوێت لە ناکاو هەموو شـتەکان گۆڕان بۆ شـتی ڕاسـتی، گریانەکەی دایکم، جنێوەکانی باوکم، پێکەنینە ناشـرینەکەی پۆلیســەکەی منی برد بۆ لایان، هەموو شـتێک بوو بە ڕاسـتی و زانیم ئەوە ئیتر خەو نییە و هەموو ئەوانەی لێرەن مرۆڤی ڕاســـتەقینەن،

ئیتر دەنگی دایکم نایە و خەبەرم کاتەوە بۆ مەکتەب، ئەوە واقعەکەیە کە تێیدام. کە زانیم هەموو شتەکان ڕاستین و ئێرە زیندانە و ئەوانەیش دایک و باوکمن. ئەوەیش خوشکە بچووکەکەمە، بۆوا بەسەیری تەمەشام دەکا؟ سەیرە، خوشکم هەرگیز بەو شێوەیە نارێک نەبووە، دایکم هەمیشە جلی زۆر جوانی لەبەر کردووە و قژیشی بۆ داهێناوە، ئەمرۆ بۆچی وا شڕ و شەپرێو دێتە بەرچاوم! بۆچی هەست دەکەم شێوەی دەگۆڕێ؟ یان وەک ئەوەی ئاوبێت سەما دەکا جەستەی؟ شتێکی نا ئاسایی هەیە دەربارەی خوشکم بەڵام ئێستا یەک پرسیار لە مێشکم دێت دە دەچێت، باشە بۆچی لێرەم و چی منی گەیاندە ئێرە؟ هەمان ئەو پرسیارەم لە دایک و باوکم کرد! بەڵام هەر کە قسەکانم تەواو کرد، باوکم زللەیەکی زۆر توندی لێ دام و دوای هەندێک جنێو، وتی: «من وام پەروەردە کردی بە دوازدەی شەو لە شوقەی کچی خەڵکی بتگرن!؟»

کە باوکم ئەو قسانەی کرد لەرزێک بە جەستەم داهات و زانیم بەهۆی پیاوەکانی شوقەکەی شێنێوە لێرەم، بەڵام دەمزانی هیچ شتێک ڕووینەداوە و من هیچم نەکردووە، کەچی دەمم تەتەڵەی دەکرد، نەمدەتوانی لەبەرانبەر باوکم و فرمێسکەکانی دایکمدا یەک وشەش چییە بیڵێم. ئیتر لێرەوە ژیانی زیندانی من دەستی پێ کرد و گەشتم بەو ڕۆژەی ببمە چیرۆکنووس و ژیانی خۆم بنووسمەوە ، با ئێستا من سەرتان

زیاتر نەهێشێنم، خۆشم هیلاکم لە تاو بیرکردنەوە و پرسیارە بێوەڵامەکانم، ڕۆژێکی تر قسەکانم تەواو دەکەم.

من هەرگیز ڕۆژێک لە ڕۆژان پێش ڕووداوەکەی ئەو شـــەوە نەبووبوومە هۆکاری گریانی دایک و باوکم، هەمیشـە کوڕێکی ئاقڵ و زیرەک بووم. بەڵام کە ئەو شـــەوە لەناو شـــوقەکەی شـێتێ ئەو پیاوانە بە بۆکسـێک منیان لە هۆش خۆم بردەوە و خۆم لە زینـدان بینییەوە، هەموو ئەو ئـاقڵی و زیرەکییەی ڕابردووم سڕییەوە. منم توانا، خۆ دەمناسییەوە؟ پێشتر دوو بەشـــی چیرۆکی ژیانی خۆمم بڵاو کردبۆوە، ئەمە سـێیەم بەشە.

دایک و باوکم کە هاتبوون لە زیندانەکە بمبینن، هیچ وەک خۆیان نەبوون، هەردووکیان بەو شەوە بە قەد ١٠ ساڵ پیر و لاواز بووبوون، ماندوێتیی بیرکردنەوە لە چاوانیاندا دیار بوو. دایکم هیچ قسـەی نەدەکرد و هات لە باوەشـی کردم و ماچی ئەکردم و بە گریانەوە دەیگوت: «ڕۆڵە بۆ وایان لێ کردی؟ کێ هەڵیفریواندی؟ چۆن من هێشـتم ئەو شـەوە بچیتە دەرەوە؟ ئاخر چۆن وامان لێ هات! نەورۆزەکەیان لێ کردین بە ژەهری

مار...» ئەوکاتەی دایکم دەیلاواندمەوە و هەڵەکەی لەسەر من لادەبرد و برادەرەکانمی تۆمەتبار دەکرد، من لەناکاو بیرم کەوتەوە کە ئەو شەوە خۆ شەوی نەورۆز بوو و بۆ بەیانی ئەبوایە بچین بۆ سەیران! من چۆن لەماڵی شێنێ مامەوە! ئاخر چۆن بە چ ئەقڵێکمەوە؟ باوکم بە تووڕەییەوە کە یەکەم جار بوو ئەوەندە تووڕە بیبینم، دایکمی لێ کردمەوە و وتی: «ئاخر توانا، من ئاوا پەروەردەم کردی؟ چۆن شتێکی وا لەگەڵ ئێمە دەکەیت؟ کەم نانمان دایتێ؟ هیچت ویستووە نەمانکڕیبێ بۆت؟ ڕۆژێک ژوورەکەت سارد بووە سەرمات بێ ئاخر؟ ڕۆژێ هێشتوومانە گەرمات بێ؟ بۆ وامان لێ دەکەی توانا، بۆ؟!» کە باوکم ئەو شتانەی دەژمارد کە بۆ منیان کردووە، من هەم تەریق دەبوومەوە و هەم بیرۆکەی ئەوە لەسەرم گەشەی دەکرد کە من وەک مریشکێک یان بزنێک لەو ماڵە گەورە کراوم، چونکە باوکم وا قسەی دەکرد وەک ئەوەی من مریشکێک بووبم و گەورەیان کردبم. ڕاستییەکەی نا، نامەوێ بێسەفەت بم و تاوانەکە لەسەر خۆم لابەرم، هەرچەندە من ١٠٠% دڵنیام لە شوقەکەی شێنێ نە دەستم بەری کەوتووە و نە بیریشم لە شتێکی خراپ کردۆتەوە، بەڵام کە دایک و باوکم قسەکانیان دەکرد، بۆم دەرکەوت من لەسەر ئەوە گیراوم کە گوایە ئەو کچەم بردووە بۆ ئەو شوقەیە و فیڵم لێی کردووە، ئەوان دەیانگوت ئاخر چۆن تۆ بەم تەمەنە منداڵییەوە

بیر لە کارێکی وا دەکەیەوە؟ من تا دەهات بەرچاوم زیاتر ڕوون دەبووەوە کە بۆچی لە زیندان بەخەبەر هاتوومەتەوە!

دواتر بینیم دوو پیاوەکە و ژنێکی گەنج بە هات و هاوار هاتن و ژنەکە پەنجەی بۆ من ڕادەکێشا و دەیگوت: «لێت خۆش نابم، لێت خۆش نابم!» من تا ئەوکاتە هیچ قسەیەکم نەکردبوو و هەر شۆک بووبووم. بەڵام دواتر بە دەنگێکی شەرمەزارەوە وتم: «باوکە گیان، دایە گیان، بەس پێم بڵێن لەسەر چی گیراوم؟» دایکم دەستی کردەوە بە گریان و باوکیشم زلەیەکی توندی لێ دام و هەستا زیاترم لێ بدات، بەڵام پۆلیسەکان گرتیان و وتیان، کاتی سەردانی کۆتایی هات. منیان بردەوە ئەو ژوورەی لێی هاتبوومە دەرەوە. من هەر کە باوکم زلەکەی لێ دام وەک منداڵێکی ساوا دەستم بە گریان کرد، ئاخر ئەوکاتە هەر منداڵیش بووم، تەنیا ١٥ ساڵ بووم، ١٥! کە چوومەوە ژوورەکە، یەکەم جارم بوو ژوورەکە بە تەواوی ببینم، چونکە من دوێنێ شەوم بیر نەدەهاتەوە، ئەوەی بیرم بێت تا ئەوکاتە بووە کە پیاوەکان شتێکیان لە سەرم دا و کۆتا شتیش بینیبێتم شێنێ بوو کە بە پێکەنینەوە وتی زۆر بە قوەت لێت دا، هەتیو! لە ژوورەکە چەند کەسێکی تری لێ بوو، هەر کە پۆلیسەکە منی بە گریانەوە بردە ژوورەکە، ئەوان لە دەورم کۆ بوونەوە و دڵیان دەدامەوە، خۆ من نە دەمناسین و نە هەرگیز ئەمانەم بینیبوو، بەڵام

هەموویـان تەمەنیـان لە خۆمەوە نزیـک بوو. من ســـەرەتـا نەمدەزانی بۆ لە تەمەنی خۆمدان، بەڵام وتیان: «ها بەخێرێی برا، دزیت کردووە یان لە ماڵی کەپڵ و شـــت گیراوی؟ بە خوا دەموچـاوت بە جەمـاعەتی خۆمـان نـاچێ، ئەوە تۆیـان بۆ گرتووە؟ بۆ دەگریەی؟» من وتم: «ها؟ ببورن بەڕێزان، من بە هەڵە گیراوم، دڵنیـام هەڵەیەک ڕوویـداوە بۆیە گیراوم، بـا حـاکمیش ببینم خۆم تێیـدەگەیێنم!» کە ئەو قســـەیەم کرد، هەموویـان دایـان لە قـاقـای پێکەنین، وتیـان: «نە بـابە؟» وتم: «وەڵا بەڕاستمە، بۆ پێدەکەنن؟» وتیان: «کورە تۆ بەتەمای کێ هەڵخەڵەتێنی! پێش ئەوەی بێیتەوە، لە پۆلیســەکەمان پرســی، جەنابتیان لە حەمام لەگەڵ کچی خەڵکا گرتووە.» دانەیەکیان کە تەمەنی لە هەموان گەورەتر دیار بوو وتی: «ئۆۆۆۆ مامە، چییە بردووتەتە هۆتێل و شـــتیش!» من نەمدەزانی چی بڵێم! ئـاخر من کوا چووم بۆ حەمـام؟ ئەی هۆتێلی چی؟ من لە هەموو ژیانم ناوەوەی هۆتێلێکم نەبینیبوو!

چەنـد ڕۆژێـک لەو شـــوێنە ڕۆشـــت و من بە تەواوەتی نەمدەزانی بۆ گیراوم! ڕاستە شتەکە وردە وردە ڕوون دەبۆوە کە شـــێنێ تەڵەی بۆ داناوم و لەبەر ئەوە گیراوم، بەڵام خۆم باوەڕم نەدەکرد شێنێ شتێکی لەو جۆرە لەگەڵ من بکات. ئەو کوڕانەشـــی لە زیندانەکە لەگەڵم بوون زۆر قســـەیان دەکرد و هەندێک جاریش بابەتیان لەســەر من دەکردەوە و قســەی زۆر

ناخۆشـــیان دەکرد. بەڵام چارم ناچار بوو، نەمدەتوانی هیچ بڵێم، دواتر دوای چەند ڕۆژێک بۆم ڕوون بۆوە ئەم زیندانەی منی لێم، تایبەتە بە کەسـانی خوار ١٨ سـاڵ و بۆیە ئەوانەش ئەوەندە بە فشە شتەکەیان وەرگرتووە، چونکە سزای کەسانی خوار ١٨ ساڵ زۆر قورس نییە و زوو ئازاد دەکرێن.

من لە لایەک خەمی دایک و باوکم بوو، لە لایەکی ترەوە خەمی ئەوەم بوو مەکتەب دەسـتی پێکردبۆوە و دەرسـەکانم لە دەسـت دەچوون، نەمدەزانی هانا بۆ کێ بەرم و پێویسـتە چی بکەم... ڕۆژێک بەیانی زوو، بانگیان کردم و دایک و باوکم هاتبوون، ئەمجارە بە پێچەوانەی جارەکەی ترەوە نە دایکم لە خۆی دەدا و دەگریا، نە باوکیشـم تووڕە بوو و نە هاواریشـی دەکرد. هەردووکیان سـەری خۆیان کز کردبوو و زۆر بێتاقەت و دڵتەنگ دەردەکەوتن، چوومە پێشەوە لێیان. وتم: «دایە، بابە گیـان، چی بووە تێمگەیێنن، بۆ وا بێتـاقەتن؟» بـاوکم بە دەنگێکی کز و نووسـاوەوە وتی «هیچ نییە کوڕم، إن شـاء الله سـبەی لێرە ئـازاد دەکرێی» من کە وای وت، دڵم زۆر زۆر خۆش بوو، باوەشـم بە دایکمدا کرد، بەڵام ئەو هیچی نەکرد، تەنیا دەسـتی بە گریان کرد، ویسـتم دەسـتی باوکم ماچ؛ وتی: «پێویست ناکا، ئێمە ئێستا دەڕۆین، سبەی خۆت حازر کە.»

من ئەو شـەوە لە خۆشـیا نەمدەزانی بخەوم یان تا بەیانی هەر بەخەبەر بم، بۆ ئەوەی سـبەی هەر کە هاتن، بیانبینم و

برۆینەوە ماڵی خۆمان! شـەو لای سـەعات ١٠ و ئەوانە، ئەو کوڕەی لە هەمووومان گەورەتر دیاربوو لە زیندانەکە و پێیان دەوت حاجی وتی: «چییە بۆ وا دڵخۆشـی؟ یەک نەزانێ دەڵێ لە جەهەننەم نەجاتی دەبێ!» وتم: «وەڵا دڵم خۆشـە حاجی گیان، بەیانی ئازاد دەکرێم، دیارە بۆیان دەرکەوتووە بێتاوانم.» کە ئەو قسـەیەم کرد، هەموویان دایان لە قاقای پێکەنین، حاجی وتی: «کورە هەی داماو، داخوا ئێسـتا چۆن باوکت و دایکتیان ڕووتاندۆتەوە! ئەوە بەڕاسـتتە تۆ؟!» وتم: «چییی؟ ڕووتاندنەوە بۆ؟» وتی: «هەتیو، ئەم کچ و شـتەی لە هۆتێل چووی بۆ حەمام لەگەڵیان، تەڵەیان بۆ داناوی، دڵنیا بە تا ئازادت کەن و لێت خۆش ببن، یەک دنیا پارەیان لە باوکت سـەندووە فەقیییییر! کە ئەو قسـانەی دەکرد، حەزم دەکرد هەستم بە هەردوو دەستم بیخنکێنم، بەڵام هەمووان لای ئەو بوون، بۆیە گەر وام کردایە تەنیا لێدانم دەخوارد. داخم ئەوە بوو قسـەکانیشـی لە ڕاسـتی دەچوون، هەم لەبەر ئەوەی پێدەچوو ئەزموونی هەبێ لە زیندان، هەم لەبەر ئەوەی دایک و باوکم ئەو ڕۆژە دڵیان زۆر توند بوو.

ئەو شـەوە لەو بیرکردنەوانەدا بووم، تا درەنگانی شـەو خەوم لێ نەکەوت، کە بەیانی خەبەرم بۆوە، بە نوکە شـەقی حاجی خەبەرم بۆوە کە دەیگوت: «هەسـتە، هەسـتە منداڵ! برۆ، ئێرە شـوێنی تۆ نییە!» من بەپەلە هەسـتام و لەگەڵ

پۆلیسەکە ڕۆشتم، کە چوومە لای ئەفسەرەکە باوکم ئیمزای لەسەر وەرەقەیەک دەکرد و ئەو ژنەش لەوێ بوو کە یەکەم ڕۆژ لە زیندان هاواری دەکرد کە لێم خۆش نابێت. من هیچ قسەیەکم نەکرد، چونکە نەمدەویست باوکم زیاتر بێهیوا بکەم. کە تەواو بوون، ئەفسەرەکە پێی وتم وەرە تۆش ئێرە ئیمزا بکە و پەنجە مۆریشی بکە، من بێ ئەوەی شتەکە بخوێنمەوە هەردووکیانم کرد و باوکم بە ساردییەوە وتی، با بڕۆین، تەواو. منیش دڵم زۆر خۆش بوو لەو شوێنە تەنگ و داخراوە کە دەڕۆمە دەرێ، بەڵام باوکم هیچ لە دڵخۆش نەدەچوو، تەنانەت نەشیوت پیرۆزە و بەخێرێیتەوەماڵەوە. دواتر لەبەر دەرگای ئەو شوێنە باوکم تاکسییەکی ڕاگرت و ناونیشانێکی سەیری بە تاکسییەکە دا کە من نەمدەزانی بۆ دەچین بۆ ئەو شوێنە! شوێنەکە لە قەراغی شار بوو، لەناو تاکسییەکەش خۆم ڕاگرت و هیچ قسەیەکم نەکرد، چونکە نەمدەویست باوکم لەوە زیاتر خەمبار بێ.

کە لە گەڕەکێکی تۆزاوی و پڕ خۆڵ و خاشاک لە تاکسییەکە دابەزیین، بە باوکمم وت: «باوکە، ئەی بۆ بە سەیارەی خۆت نەهاتی؟ چی دەکەین لێرە؟ با بچینەوە ماڵێ...» کە ئەو قسانەم کرد، باوکم زۆر بە توڕەییەوە دەستێکی گرتم و فڕێی دامە سەر ئەرزەکە، وتی: «ئاخر لەبەر زەوقی جەنابتانە ئێمە ناچارین سەیارە و خانوو بفرۆشین و بێین بۆ

ئەو کولانە سـەگە بژیەین، ئەوەش بەڕێزتان، بزانن کە کچی خەڵکی بە یاری دەزانن و دەیبەن بۆ هۆتێل!» من نەمدەزانی باوکم باسی چی دەکا، بەڵام لەوەندە تێگەیشتم بەهۆی منەوە خانوو و سـەیارەکەمانمان لە دەسـت داوە و ئەویش زۆر توڕەیە. وتی: «هەسـتە، هەسـتە... خۆت فەقیر نەکەی! هەسـتە بە ملی شـکاوت، بڕۆ ژوورێ، ئەوە کولانە سـەگەکەیە کە لەمەودوا لێی دەژییەین، هەمووی لەبەر حەمامێکی جەنابتان» من قورگم پڕی گریان بوو و و فرمێسـک بە چاومدا دەهاتنە خوارێ، بەڵام نەمدەویست وا خۆم نیشـان بدەم کە دەگرییەم. هەسـتام و چوومە ناو ئەو خانووەی باوکم بەردەوام پێی دەگوت کولانە سـەگەکە. کە چوومە ژورەوە دایکم بەپەلە هات و باوەشـێکی پێدا کردم. لەبەر خۆیەوە هەر دەیگوت: «کوڕم، بۆ؟ بۆ؟ ئاخر بۆ وات لێ کردین؟!» منیش ئەو کاتە بە تەواوی لەو حاڵەی تێیدا بووم بێزار بووم و پرسـیم: «دایکە، بەس تێمگەیێنن چی بووە؟ بە قورئان نازانم، بە خوا نازانم، نازانم چی بووە! بەس تێمگەیێنە!» دایکیشـم باوەشـەکەی لێ کردمەوە و چۆوە جێگاکەی خۆی دانیشـت و بە دڵێکی پڕەوە وتی: «هیچ نەبووە وەڵا کوڕم، تۆ چووی کچی خەڵکت بردووەتە حەمام و برا و باوکی کچەش گرتوویانی و تێریان تێهەڵداوی، ئینجا بۆ ئەوەی لێت خۆش ببن و نەگیرێیت، هەرچیمان هەبوو فرۆشـتمان بۆ جەنابت، بۆ ئەوەی پارەکەی

بدەین بە خێزانی کچەکە تا لێت خۆش ببن. ئێستا تێگەشتی؟ جوان تێگەشتی!»

ئەوکات پشتم بە دیوارەکەوە دا و سەرم خستە ناو کۆشی خۆم، تێگەیشتم هەوڵدان بۆ ئەوەی بڵێم بێتاوانم بێ سوودە، زانیم کە هیچ کەسێک باوەڕم پێ ناکات کە من دەستم لە شێنێ نەداوە، زانیشم کە ئێستا ئێمەماڵێکی هەژارین و هیچ شتێکمان نەماوە، بەڵام بەڵێن بێ، بەڵێن بێ تۆڵەی ئەوەتان لێ بکەمەوە، دەبێ پەشیمانتان بکەمەوە لەوەی بە منتان کرد، منتان لە کەسێکی باش و زیرەک و خاوەن سیقەوە کرد بە کەسێکی پیس و چەپەڵ، کە بووەتە هۆکاری هەژاریی خێزانەکەی. چاوەڕێم بن من بەو شێوەیە وازتان لێ ناهێنم.

یەک دوو ڕۆژ لە ماڵەوە مامەوە و بۆ نانخواردن و ئاوخواردنەوە نەبێت لە ژوورەکەی خۆم نەدەهاتمە دەرەوە، ئەوانەیشم هەر لەبەر دڵی دایک و باوکم دەکرد، ئەگینا هیچم پێ نەدەخورا، ڕێک دوای ٣ ڕۆژ دایک و باوکم زۆریان لێم کردەوە کە بچمەوە مەکتەب، ئەوان دەیانگوت دەبێ بەسەر ئەو ڕووداوە زاڵ ببی و داهاتوویەک بۆ خۆت بونیات بنێیت، من نەمدەویست لەوە زیاتر دڵیان بشکێنم کە ئێستا شکاندوومە، بۆیە هەرچییەکیان وتبایە، دەموت بەڵێ، بەسەرچاو. هەر کە بەیانیی ئەو ڕۆژە هەستام بچمەوە بۆ مەکتەب، هەستم کرد ئەمڕۆ ڕۆژێکی ئاسایی نابێت و لە ڕۆژێکی باشیش ناچێت، یەکەم لەبەر ئەوەی لە کابووسی شێنێدا بەخەبەر هاتم کە لەگەڵ کۆدۆ و لیزاندا پێم پێدەکەنین؛ دووەم لەبەر ئەوەی بەم بەهارە هەورێکی ڕەشی هێنابوو و وەک زستانێکی سارد باران دەباری. هەرچۆنێک بێت هەستام و وەک ڕۆژانی پێش ڕوودانی ئەو ڕووداوە، نانم لەگەڵ دایک و باوکم خوارد، پێشتر دەنگی پێکەنینمان دەگەشتە دەرەوە و

باسی دەرەجە و شتی خۆمم بۆ دەکردن، بەڵام ئەو ڕۆژە، لەو ماڵەدا، نە لە من و نە لەوانەوە یەک وشـەیش نەبیستـرا و زۆر بە سـاردی و قورگی پڕ گریانەوە بەڕێکەوتم بۆ مەکتەب، کە لە دەرگای مەدخەلەکە چوومە دەرەوە، باوکم وتی: «پارەت پێیە بە پاس بچی؟» وتم: «ئا ئا، خەمت نەبێ!» و خێرا ڕۆیشتم، چونکە دەمزانی بمێنمەوە گریـان وازم لێ نـاهێنێـت. من لە خەیاڵی ئەوەدا نەبووم ماڵمان گواسـتراوەتەوە بۆیە باوکم دەڵێ بە پاس بچۆ، کە چوومە دەرێ ئینجا بیرم هاتەوە ئێمە لە خانووە خۆشـە جوانەکەی خۆمان نەماوین و ئێسـتا لەم کەلاوەیە دەژین کە زۆر لە مەکتەبەکەمەوە دوورە! ئەوکات نەمتوانی خۆم ڕاگرم، هەر یەک تۆز لە ماڵ دوور کەوتمەوە، دەسـتم کرد بە گریان، بەڵام ئەوەی تێبینیم کرد ئەوە بوو، هەسـتم دەکرد بەو ماوە کەمە زۆر تەمەنم گەورە بووە و بیرکردنەوەکـانم گۆڕاون! کۆمەڵێـک بیرۆکەی زۆر سـەیر مێشکیان داگیر کردم کە لەوەو پێش بە خەیاڵیشما نەهاتوون.

لە ڕێگا لەگەڵ پاسـەکە ڕۆیشـتم و نزیکەی ٥ دەقە پێش ئەوەی دەرسـی یەکەم دەسـت پێ بکا، گەیشـتمە مەکتەب. لە بەردەرگای مەکتەب تۆزێ وەسـتام و هەناسـەیەکی قووڵم هەڵکێشـا، منێک بەو هەموو وزە و پێکەنینەوە دەهاتمە بەر ئەم دەرگایە و وەڵامی هەموو پرسیارێکی مامۆستام پێ بوو، ئێسـتا خۆیشـم نازانم بۆ لێرەم و نازانم چ وانەیەکمان هەیە و

کام مامۆستایە ئەمڕۆ دەرسمان پێ دەڵێ... لەو بیرکردنەوانەدا بووم جەرەسی چوونەژوورەوە لێیدا و بە کزی چوومەوە پۆلەکەی خۆم و بینیم، کۆدۆ هەر وەک جاران لە شوێنەکەمان دانیشتووە، کە چوومە ژوورەوە هەموو تەلەبەکان سەیریان دەکردم، یەکێک لەو برادەرانەی کۆدۆ کە هەرگیز دانووی لەگەڵ مندا نەدەکولا، بە دەنگێکی بەرز وتی: «هاااااا مام توانا، حەمام خۆش بوو؟» ئەوکاتە هەموو دەمارەکانی دەستم پڕ خوێن بوون و دەمویست بچم بە هەموو هێزم مستی لێ بدەم تا لە هەناسە دەکەوێ، بەڵام بیرم کەوتەوە و بە خۆمم وت: «چییە توانا، دەتەوێ دووبارە دایک و باوکت گرفتار بکەیتەوە؟» بۆیە هیچم نەوت، بەڵام کۆدۆ بە جواب هات و وتی: «وس بە تۆ لە خۆتەوە ئاگات لە هیچ نییە و هەڵدەدەیتێ!» وتیشی: «وەرە توانا گیان، من لێت تێدەگەم، وەرە دانیشە لە جێگاکەی خۆت!» هەر کە ئەو قسەکەی کرد، مامۆستا لە پشتمەوە دەرکەوت و وتی: «توانا، بۆ دانانیشی کاکە؟ دانیشە دەست پێ دەکەین.» من سەرم سوڕ مابوو، چۆن کۆدۆ قسە لەگەڵ من دەکات؟ ئەسڵەن چۆن ڕووی دێ قسە لەگەڵ مندا بکا؟ ئەو کارەساتەی بەسەرم هاتووە هەمووی دەستی کۆدۆیە، هەمووی خەتای ئەوە، ئاخر ئەگەر ئەو منی بە شێنی نەناساندبایە، من ئێستا ئەوە حاڵم نەدەبوو، ئاخر چۆن ڕووی دێ بە من بڵێ لە تەنیشتی دانیشم، چۆن؟

ئەو ٤٠ دەقەیەی ئەو دەرسی یەکەمە، بۆ من وەک ٤٠ ڕۆژ وا بوو، نەدەڕۆیشت و نەدەڕۆیشت، ئاخر من دەمویست بزانم کۆدۆ بە چ ڕوویەکەوە ئەو قسـەیەی کرد! چۆن وا ڕەفتار دەکـات وەک ئەوەی هیچ ڕووی نەدابێ؟ زۆر سـەیر بوو زۆررر! کە زەنگ لێیدا، یەکسـەر ڕووم لە کۆدۆ کرد و وتم: «ئەرێ تۆ تەواوی؟ تۆ چۆن لە ڕووت دێ قسـە لەگەڵ من بکەیت ها؟ دوای ئەو هەموو ڕووداوە و ئەو پەندەی پێت دام، ئێسـتـا هـاتووی ڕۆڵی برایەکی گەورە بۆ من دەگێڕی و پاڵپشـتیم دەکەی ها؟» ئەو زۆر بە لەسـەرخۆیی وتی: «توانا گیـان، من داوای لێبوردن دەکەم بۆ هەموو ئەو شـتـانەی ڕوویان داوە، ئەگەر من بە خەتابار دەزانی، ئێسـتـا ئامادەم خۆم بکوژم و کۆتایی بە ژیانی خۆم بێنم!» کە ئەو قسـەیەی کرد، تووشـی شـۆک بووم! ئەوە کۆدۆیە ئەو قسـانە دەکات؟ ئەی ئەگەر ئەوان پێکەوە کار نەکەن، چۆن ئـاوا لەگەڵ یەکن هـا؟! وتم: «کۆدۆ ڕۆڵ مەگێڕە عەیبە، بـاش ئەزانی چیتـان کردووە و چیتان بەسـەر هێناوم.» ئیتر یەکسـەر ڕۆیشـتم و نەمویسـت زیاتر گوێی بۆ بگرم، کە لە پۆلەکە ڕۆیشـتمە دەرەوە، وتی: «توانـا، دڵنیـا بە شـتـەکـان وەک ئەوە نین تۆ بیریان لێ دەکەیتەوە.» چوومە حەوشـەی مەکتەبەکەمان و مێشکم زۆر زۆر ئاڵۆز بووبوو، نەمدەزانی چ شـتێک ڕاستە و چ شـتێک درۆیە... کۆدۆ وا قسـەی دەکرد کە من سـەرلەبەری

کارەکە بە هەڵە تێگەیشتووم، کەچی من وا تێگەیشتبووم فیڵم لێ کراوە و دایک و باوکیشم وا تێگەیشتبوون من فیڵم کردووە! نەمدەزانی کام لەم قسانە ڕاستن، بەڵام ئەوەندەم دەزانی کە لە ئێستادا نابێ گوێ بۆ قسەی برادەر بگرم و سیقەیان پێ بکەمەوە.

لەو بیرکردنەوانەدا بووم مامۆستای بیرکاری وتی: «توانا توانا، ئەوە بۆ ناچیتە ژوورەوە؟ کەس لە دەرەوە نەماوە، بەس تۆی لێیت.» من لەبەر بیرکردنەوەکانم ئاگام لەوە نەمابوو کە جەرەسی ژوورەوە لێی داوە و لەگەڵ مامۆستاکە چوومەوە ژورەوە و بێ ئەوەی سەیری دەموچاوی کۆدۆ بکەم دانیشتمەوە. جەڕەسی دووەم لێیدا و کۆدۆ یەکسەر دەستی لەسەر شانم دانا، وتی: «توانا گیان، گوێ بگرە، باوەڕ بکە شتەکان بەو جۆرە نین کە تۆ بیریان لێ دەکەیتەوە، تەنیا دوو - سێ دەقە گوێ بگرە و تەواو!» وتم: «کۆدۆ تۆش لە شوێنی من بوایەی باوەڕت بە یەک وشەیش نەدەکرد کە لە دەمتەوە دێتە دەرێ، بەڵام دەی بڵێ بزانم ئەمجارە دەڵێی چی!» وتی: «لێرە نابێ، لێرە نابێ توانا، زۆر مەترسیدارە شتەکە، بۆیە دوای دەوام وەرە کافتریای زێڕ، لەوێ هەموو شتێکت پێ دەڵێم، هەموو شتێک» وتم: «باش، با ئەمەش بە دڵی تۆ بێت کۆدۆ، دێم و کۆتا قسەی خۆمان دەکەین.» هەر چوار دەرسەکەی داهاتوو نەمدەزانی کەی جەرەس لێ دەدات و

بابەتی دەرسەکە چییە و مامۆستاکە کێیە و باسی چی دەکات، هەموو ئەوەی بیرم لێ دەکردەوە قســـەکانی کۆدۆ بوو، ئاخر ئێوەش لە جێی من بوونـایە هەمـان بیرکردنەوەتـان دەبوو، بێگومان ئەوان فێڵیان لە من کردووە بۆ پارە، ئەوە تاکە شتێک بوو کە من دەمتوانی ئەوکاتە بیری لێ بکەمەوە.

دوای دەوام بەپەلە و بە ڕاکردن چووم بۆ ئەو کافتریایەی کە کۆدۆ باســـی کرد، زۆر دوور نەبوو لە مەکتەبەکەمـان و پارەی تاکسیشم پێ نەبوو، بۆیە هەر بە پێ ڕۆشتم بۆ ئەوێ، کە چووم کۆدۆم نەبینی، لەسـەر مێزێک دانیشـتم و چاوەڕێم دەکرد، نزیکەی ١٠ دەقەیەک چـاوەڕێ بووم و زانیم فێڵێکی تر لە گۆڕێیە، بۆیە یەکســـەر هەســـتام بڕۆم، لەبەر دەرگای کافتریاکە کۆدۆ و لیزانم بینی، بەیەکەوە دەهاتنە سـەرەوە، کە لیزانم لەگەڵ کۆدۆ بینی زۆر تووڕە بووم، چونکە لیزان و شـــێنێم بە یەک جۆر دەهـاتە بەرچـاو، هەردووکیـان دووکچ بوون لەشـــی خۆیان بۆ پارە دەفرۆشـــت! کۆدۆ وتی: «توانا، تووڕە مەبە، ســـوێنـدت بۆ دەخۆم کە قســـەکـانم کرد، بیرکردنەوەکانت دەگۆڕێن، بۆیە لیزانیشـم هێناوە، ئەو باشـتر دەتوانێت تێت بگەیێنێ، بەڵێن دەدەم ئەگەر قسەکانمانت بە دڵ نەبوو یان یەک دانە درۆیشـــی تێدا بوو، کۆتا جار بێ قســـەت لەگەڵ بکەم و ئیتر گوێم لێ مەگرە، بەڵێنـت پێ دەدەم.» هەرچۆنێک بێت لەگەڵیان چوومەوە ژوورەوە و دانیشـــتین،

سـەرەتا هیچیان قسـەیان نەدەکرد و تەنها سـەیری یەکیان دەکرد، دواتر کۆدۆ دەسـتی بە قسـەکردن کرد، کۆدۆ وتی: «توانا گیان، دڵنیا بە تۆ یەکێکی لە هاوڕێ هەرە نزیکەکانی من، ئەوەی ڕوویشـی دا لەگەڵ شـێنێ دەزانم شـتێکی زۆر ناخۆشە، بەڵام دڵنیا بە ڕاستییەکە وەک ئەوە نییە تۆ بیری لێ دەکەیتەوە. سـەرەتا دەمەوێ پێت بڵێم من و لیزانیش تازە زانیومانە شێنێ لەو شتە تێوە گلاوە، بە جوانی گوێم بۆ بگرە بۆت شـی دەکەمەوە، چونکە من لیزانیشـم بەو شـێوەیە ناسیوە، ئەمانە باندێکن، کچی بێسـەرپەرشـت و بێکەسوکار دەفڕێنن و هەڕەشـەیان لێ دەکەن و دەسـتدرێژییان دەکەنە سـەر و وێنەیان دەگرن، دواتر ئەو جۆرە کارانەیان پێ دەکەن کە شـێنێ لەگەڵ تۆ کردی. بە کورتی توانا، با لە کاتی یەک نەگرین، لیزانیش هەمان شتی لەگەڵ چەندین کوڕ کردووە، تا من دۆزیمەوە و لە باندەکە ڕفاندم، ئەوان لە شـارێکی تر کاریان دەکرد، من لیزانم هێناوە بۆ ئێرە و شوققەم بۆ گرتووە تا لێرە بژییێت و خۆشـمدەوێت، شـێنێیش هەمان شـتە، ئەو کارانەی بە زۆر پێ دەکەن، بۆ پارە، پارەکەیش یەک دیناری بۆ خۆی نییە، ئەو سـەیارەیەی پێی بوو ئەو شـەوە ئێمەش سـەیرمـان هـات کە شـتێکی وای پێیە، چونکە ئێمەش نەماندەزانی شـێنێ بە زۆر کاری پێ دەکرێت، ئێسـتا لەوانەیە بپرسـی چۆن زانیمـان شـێنێش وەک لیزانە و بەزۆر ئەم

کارانەی پێ دەکەن، وا نییە؟ با من پێت بڵێم توانا گیان، شێنێ زۆر زۆر گریاوە و بە گریانەوە قسەی بۆ من و لێزان کردووە، دەیوت من نازانم چۆن سەیری ڕووی توانا بکەمەوە، بەڵام بە خوا بە خوا نەمکردایە هەر لەناو شوقەکەدا دەیانکوشتم، ئەمانە هەمووی بەهۆی لێزان گیانەوە زانیمان، چونکە ئەو سەرەتا گومانی کرد کە شێنێش لە کارێکی واوە تێوەگلابێت و وتی با بچین قسەی لەگەڵدا بکەین، جا کە چووین، بە گریانەوە ئەم قسانەی بۆ ئێمە کرد و زانیمان مەسەلەکەی شێنێش وەک ئەوەی لێزانە، لەژێر هەڕەشە و ترساندن و تۆقاندندا ئەم کارانەی کردووە و تۆیش یەکەم نێچیری بوویتە، بەڵام زۆری خۆشدەوێی توانا، بە خوا زۆری خۆشدەوێی...

کۆدۆ بەردەوام بوو لە قسەکردن، بەڵام کە ئەم قسانەم بیست وەک بڵێی ئاگام لە کۆدۆ نەما چی تری وت. بەردەوام ئەو قسەیەی کۆدۆ کە دەیوت خۆشیدەوێی لە گوێمدا بە دەنگی شێنێ دەزرینگایەوە و هەر دەیوت: بە خوا زۆرم خۆشدەوێ، زۆرم خۆشدەوێ.

لە دوای ئەو شـــتانەوەی کە کۆدۆ بۆی گێڕامەوە و لەگەڵ لیزان بیانوویان بۆ کارەکانی شینێ دەهێنایەوە، بۆ ساتێک دڵم نەرم بووبوو بەرانبەر شینێ و خەریک بوو لێی ببوورم، بەڵام چەند ڕۆژێک دواتر بیرم کردەوە، چۆن کەسێک شتێکی وا بەرانبەر خێزانێک دەکات ئاخر؟ چونکە ئەو، ئەو کارەی تەنیا بەرانبەر من نەکردبوو، بەڵکە بەرانبەر هەموو خێزانەکەم کردبووی. کە بەیانیان باوکمم دەبینی ئەوەندە ماندووە و وەک جاران تاقەتی نەماوە ڕیشی بتاشێ، کە دەمدیت دایکم بەو کاتە کەمە چەندە پیر بووە، نەمدەتوانی لە شینێ خۆش بم، بۆیە ڕۆژێک چوومەوە لای کۆدۆ و پێم وت: «نە من ئێوە دەناسم، نە ئێوەش من دەناسن، نە دەیشتوانم لە شینێ خۆش ببم، بڕۆن خۆتان و چیرۆکەکانتان، من ناتوانم هیچ شتێکتان بۆ بکەم.

لە دوای ئەو کاتەوە من هەوڵم دەدا وەک جارانم لێ بێتەوە، خۆم لە هەموو کەسێک دوور دەخستەوە، وازم لە هەموو

سـۆشـیاڵ میدیاکان هێنا و مۆبایلەکەمم فرۆشـت، بە پارەی مۆبـایلەکەم ئـایپادێک و مۆبـایلێکی نـازیرەکم کڕی کە بەس تەلەفۆنی پێ دەکرا و بەس ژمارەی دایکم و باوکمم تێدا خەزن کردبوو، لە ئایپادەکەیشـم جگە لە یوتیووب و چەند یارییەکی زۆر کەم هیچی ترم خەزن نەکردبوو. بەردەوام لە سـووچێکی ژووری خەوتنەکە کە تاقە ژووری ماڵە تازەکەمان بوو -جگە لە هۆڵێکی بچووک و مەتبەخەکە- و دایک و باوکم دابوویانە من، بەردەوام لەو ژوورە لەگەڵ کتێبەکانمدا بووم، ئەو ساڵەی ئەو ڕووداوەم بەسـەردا هـات نەمتـوانی وەک جـاران لە یەکەمەکان بم، بەڵام شەوێک وەک هەموو شەوە بێدەنگەکانی تر لە کاتی نانخواردن کە لەگەڵ دایک و باوکم هیچ قسـەیەکی ئەوتۆمان نەدەکرد، بێدەنگییەکەم شکاند و وتم: «دایکە، باوکە، بەڵێن بێ، بەڵێن بێ، هەموو سـاڵەکانم لە خوێندن بە یەکەمی تەواو کەم، بەڵێن بێ قسـە لەگەڵ هیچ کەسـێک نەکەمەوە و برادەرایەتیی هیچ کەسـێک نەکەم، کتێبەکانم و ئێوە بکەم بە باشترین هاوڕێم و سۆشیاڵ میدیاکانم هەمووی دابخەم، ئێوە بۆ من هەموو شـتێکن.» دایک و باوکم هەردووکیان دڵیان پڕ بوو و هەستان و باوەشیان پێمدا کرد، دڵنیا بووم هەردووکیان دەگریان، بەڵام باوکم وا خۆی دەردەخست کە ناگرییێت، چونکە لێرە گریانی پیاو عەیبە! لە دوای ئەو شـەوەوە هەموو شـتێک لە خێزانەکەمـدا گۆڕا، بەیـانیـان قسـە کەم کەم دەسـتی

پێکردەوە، باوکم زیاتر و زیاتر دەگەشایەوە و دایکیشم چێشتەکانی وەک جارانیان لێ هاتەوە. ئەو هاوینە لای برادەرێکی باوکم دەستم کرد بە فیتەری، هەر بە خۆبەخشی ئیشم لای دەکرد بۆ ئەوەی فێر ببم، لە یوتیووب بەردەوام سەیری چاککردنەوەی ئۆتۆمبێلەکانم دەکرد و دەمویست بە شێوازێکی زانستی فێری ئیشکردنەکە بم. دوای مانگی یەکەم زۆربەی ئەو شتانەی لە شارەکەی ئێمە دەکران بۆ سەیارەکان، منیش دەمزانین، هەندێک شتیشم دەزانی دەربارەی ئۆتۆمبێلە ئەمریکییەکان، لە یوتیووبەوە فێریان بووبووم، زۆربەی وەستایەکان نەیاندەزانین، بۆیە زۆربەی ئەوانەی سەیارەی ئەمریکییان هەبوو دەهاتنە دوکانەکەی ئێمە بۆ چاکردنەوەی سەیارەکانیان لە دوای چەند سەیارەیەک کە من چاکم دەکردنەوە و وەستایەکەم سەری دەسوڕما، یەکەم ٥ هەزاری پێ دام و وتی: «هەر بژییت کوڕەکەی مامۆستا ئازاد، بە خوا قەت باوەڕ ناکەم ئەو بەزمەی باسی دەکەن تۆ کردبێتت، ماشەڵڵا زۆر زیرەکیت.» منیش زۆر سوپاسی وەستام کرد، چونکە بە ڕاستی لەبەر خاتری باوکم زۆر هاوکاریی دەکردم و فێری شتەکانی دەکردم.

لەو کاتە بەدواوە ڕۆژانە یەک دوو سەیارەم چاک دەکردەوە و وەستاکەم پارەکەیانی بە خۆم دەدا، زۆربەی ئەوانەی دەهاتن سەیارەکانیان مۆدێل بەرزبوون و دەوڵەمەند بوون،

بۆیە سەیارەی ئەمریکییان کڕیبوو و دڵیان نەدەهات بیبەنە شوێنی تر. هاوین ڕۆیشت و من توانیبووم بە ئیشەکەم ٧٨٤ هەزاری ڕێک کۆ بکەمەوە، ئاوێکیشم بەو پارەیە نەکڕیبوو، چونکە پلانێکی تایبەتیم بۆی دانابوو. کە دەوام هاتەوە، ئیشەکەم کەوتە لاوە و نەمدەزانی چۆن کاتی بۆ تەرخان بکەم، بەڵام نەشمدەویست وازبێنم، بۆیە بە وەستاکەمم وت ئەو ڕۆژانەی کە بەیانیان دەوامم هەیە عەسرەکەی دێمە ئێرە و ئەگەریش نیوەڕۆیان دەوامم هەبوو بەیانیان دێم. ئەویش پارچە تەختەیەکی بە دیوارەکەدا کردبوو، کاتی کارکردنمان نوسیبوو بۆ سەیارە ئەمریکییەکان، شەوانیش یەکسەر دوای نانخواردن دەستم بە خوێندن دەکرد تا دەخەوتم، بەس ئەگەر بۆ میوەخواردنێک شتێک چووبامایە لای دایک و باوکم، ئەگینا بەردەوام دەمخوێند، هەندێک شەو زوو لە خوێندنەکانم دەبوومەوە، یەکسەر دەچوومەوە یوتیووب تا شتی زیاتر لەسەر سەیارەکان فێر ببم. ئیتر بەو شێوەیە دواناوەندیم تەواو کرد و چوومە پۆلی ١٢.

لە پۆلی ١٢یش هاوینەکە لە فیتەری بەردەوام بووم و هەر یەکسەریش دەستم بە لەبەرکردنی کوردی و ئینگلیزی کرد و زوو زوو عەرەبییەکەیشم دەخوێندەوە، زۆر بوو، سێ مانگ بەردەوام سەعی و ئیشم کرد. کە دەوام کرایەوە، دایک و باوکم سوور بوون لەسەر ئەوەی دەبێ واز لە فیتەرییەکە

بێنم و بەردەوام بخوێنم تا بتوانم دەرەجەیەکی زۆر باش بێنم، چونکە ئەوان حەزیان لێ بوو ببم بە دکتۆر، منیش لەبەر دڵخۆشیی ئەوان ئامادە بووم هەموو شتێک ئەنجام بدەم. بە قسەی دایە و بابە وازم لە کارکردن هێنا و بە درێژایی ساڵێکی خوێندن لە ژوورەکەی خۆم و تەختە ڕەقەکەی مەکتەب زیاتر هیچ شوێنێکی ترم نەبینی، وام لێ هاتبوو زۆربەی کتێبەکانم لەبەر بوو، دەمتوانی لە یەکەم وشەوە تا کۆتا وشەیان بڵێمەوە، دایک و باوکیشم ئەو ساڵە سەردانییەکانیان زۆر کەم کردەوە و ئاگام لێ بوو باوکم بە ناڕاستەوخۆ بە هاوڕێکانی و خزمەکانیشمانی وتبوو کە کوڕمان پۆلی ١٢یە بۆ ئەوەی کەمترین کات میوانمان هەبێت و دەنگە دەنگ لە ماڵمان بێت، تەنانەت تەلەڤزیۆنیشیان زۆر بە کەمی پێدەکرد و لەبەر خاتری من کز کزیان دەکرد. لای من پۆلی ١٢ شتێکی ئەوتۆ نەبوو و زۆر بە ئاسانی دەمتوانی لە هەموو کتێبەکان تێبگەم و تاقیکردنەوەکانیش ئەنجام بدەم، هەر کە لە کۆتا ئیمتیحان بوومەوە و چوومەوە ماڵەوە، بە دایک و باوکم وت: «بەلانی کەمەوە ٩٧ دێنم، دڵنیا بن، بەڵام لێم گەڕێن بچمەوە سەر کارەکەم، چونکە بەڕاستی دەمەوێ کار بکەم.» بەڵام ئەو ڕۆژە وتیان نابێ بچیتە کار و دەچین سەفەرێک دەکەین و لە چێشتخانەیەک نانێک دەخۆین. ئیتر ئەو ڕۆژە زۆر بە خۆشی کۆتایی هات و بۆ بەیانی یەکسەر چوومەوە سەر ئیشەکەم.

لە دوای ماوەیەک لەســـەر کار بووم، دایکم تەلەفوونی بۆ کردم، بە گریانەوە وتی ٩٨.٧م هێناوە و وتیشــی ئەم ئێوارەیە زووو وەرەوە ماڵ، خۆشــترین خواردنم بۆ لێناوی و، بەردەوام لە تەلەفوونەکە خۆی بە قوربان دەکردم. ئەو ڕۆژە زۆر زۆر دڵم خۆش بوو، چونکە دایکموان وایاندەزانی ئەوە تاکە شــتی باشــە بۆیانم کردبێت، نەیاندەزانی لە ماوەی ســێ ســاڵی ڕابردووی ئیشکردنم پارەیەکی وام کۆکردۆتەوە بتوانین لەگەڵ خانووەکەی ئێســتاماندا لێکی بدەین و خانوویێکی باشــی پێ بکڕین، خــانوویێــک لە نزیـک شــــار بێـت و لە دەوامەکەی ئەوانیشــەوە نزیک بێت. کە چوومەوە ماڵەوە ئەوان بە حسابی خۆیان ســـوپرایزیان بۆ من کردبوو، کێک و شـــتیان ئامادە کردبوو و ســەر سفرەیان بە خواردنی جۆراوجۆر ڕازاندبۆوە، هەر کە چوومەوە دایکم هاتە پێشـــەوە و باوەشــێکی توند توندی پێدا کردم و باوکیشـم هاتە لام و دەسـتی لەسـەر شانم دانا، هەردووکیان پێدەکەنین و دایکم لە دڵ خۆشـــییان هەل هەلەی لێدەدا، بەڕاســـتی ئەوە ئەو ڕۆژە بوو کە زانیم تەنیا دایک و باوک لە خۆت دڵخۆشـترن کاتێک شـتێکی باش ئەنجام دەدەیت و شـــتێک بەدەســـت دەهێنیت، تەنیا ئەوانیش کاتێک شـــتێکت بەســـەردا دێت، دڵیان لە خۆت تەنگتر دەبێت، کە لە پیرۆزبــایی و مــاچەکــانیــان بوونەوە، وتم: «دایکە بــاوکە، ســـوپرایزێکی تریشـــم هەیە بۆتان.» وتیان: «چییە؟ بە تەمای

چیت توانا، ئەممان؟!» وتم: «مەترسن، مەترسن!» دەخیلەکەمم هێنا کە خۆم لە گەراج بە تەختە دروســـتم کردبوو، وتم: «ســـەیری ئەوە بکەن، ئەوە هەرچی تێدا بوو، لەگەڵ پارەکانی خۆتان دەیبەن و خانوویێکی باشـــی لە ناو شـــار پێ دەکڕن، نەک لە شـــوێنێکی وەکو ئێرە!» وتیان: «ئادەی بزانین چەندی تێدایە.» باوکم وتی: «من بە معاشـــی خۆم و دایکت پارەی نیو خانووم کۆکردۆتەوە، بزانین تۆ چیت کردووە؟» من ئەو ســـێ ســـاڵە نە جلێکم کڕیبوو، نە ئـاوێـک، نە جبزێکم، لە هیچ شـــوێنێک پارەم خەرج نەکردبوو، هەم ئەوەی دایک و باوکم پێیان دابووم و هەم ئەوەیشـــی پەیدام دەکرد، هەموویم لەناو ئەو دەخیلە کۆ کردبۆوە، چووم لەسەر قادرمەکە چەکوشێکم هێنا و دەخیلەکەم شـــکاند، چونکە ٢٥٠ دیناریی تێدا بوو، پڕ بوو لە ٥ هەزاری، چەند ١٠٠ دۆلارییەکیشـــی تێدا بوو کە کەســـە زۆر دەوڵەمەندەکان وایان زانیبوو تازە ســـەیارەکانیان لای کەس چـاک نـابێتەوە و من بۆم چـاکردبوونەوە، پێیـان دابووم... کە پارەکەمان ژمارد، باوکم هات و باوەشـــێکی وای پێدا کردم، تا ئێســـتا باوەشـــی ئەوەندە دوور و درێژی پێدا نەکردبووم، وتی: «جا خۆ کوڕم ئەمە بەشی ئەو خانووە دەکا کە ماوەیەکە لەگەڵ دایکت چاومـان چووەتە ســـەری، بەس چۆن ئێمە دڵمان دێ پارەی تۆ بدەین بە شتی خۆمان؟! کوڕم، بە خوا قبووڵی نـاکەین.» وتم: «بـاوکە، خۆم بـاش دەزانم من

هۆکاری لەدەســـتدانی خانووەکەی ترمان بووم، بۆیە هیچ لەســەر ئەم بابەتە مناقەشــە مەکەن، هەمووی هیی ئێوەیە.»

باوکم ئەمجارە زۆر لە دایکم زیاتر هەســتەکانی لەســەر دەموچاوی دەرکەوتن و دڵی زۆر لە دایکم خۆشــتر دیار بوو، بە پێکەنینەوە وتی: «ئەوە تۆ چیت کردووە! خۆ ئەمە تۆزێکی تری لەســەر دابنێین، ســەیارەیەکیشــی پێ دێ!» دایکم: وتی: «نا، نا، پیاوەکە تخوا پەلە مەکە با نەبین بە چاوەوە، با جارێ خانوویێکی خۆشمان هەبێت، خوا گەورەیە بۆ ســەیارە، پەلەی لێ مەکە.»

لە دوای ئەو شەوەوە چووین و خانووە تازەکەمان کڕی و ماڵمان دووبارە گواستەوە، ئیتر کە خانووەکەمان خۆشتر بوو و وەزعمان باشــتر بوو، میوانی زیاتریشــمان دەهات و زیاتریش پێکەوە دەچووینە دەرەوە. ســەرەتای پاییز، ناو هاتەوە و منیش چوومە زانکۆ، هەر بەردەوام بووم لە کارکردن و جلی تازەم بۆ خۆم کڕی و ژیانمان وەک جاران و باشتریشی لێ هاتەوە، لە زانکۆیش لە یەکەم ڕۆژەوە دەستم بە خوێندن کرد و چەند هاوڕێیەکی تازەم ناســی و بڕیارم دا دەســت بە ژیانێکی تازە بکەم و هەوڵی دۆزینەوەی بەختەوەری بدەم.

ساڵ هاتن و ڕۆشتن، توانا لەپاڵ خوێندنەکەیەوە دەستی دایە ئیشکردن، دووبارە گەڕایەوە بەر ئیشکردن، بەڵام ئەمجارەیان بە پێچەوانەی ساڵانی پێشووترەوە، ئیشێکی دەکرد کە لەگەڵ پیشەی داهاتووی خۆیشی دەگونجا، چونکە توانا هەمیشە کەسێکی چاک بوو، ڕاستە ڕووداوەکانی شێنێ ژیانی لەبنەوە هەڵتەکاندبوو، بەڵام ئەو بە کۆڵنەدان و کڕینەوەی خانووەکە بۆ خێزانەکەی، توانیبووی ئەو برینە سارێژ بکات کە کەسایەتیی ئەوی کردبووە قوربانی یارییەکی مەترسیداری کچێک.

بەڵێ، منم، توانا، نازانم بۆ هەندێک جار وەک کەسێک لە دەرەوەی خۆم بێت شتەکان باس دەکەم و وەک کەسێکی تر لە خۆم دەدوێم، هەرچۆنێک بێت ئێستا لە قۆناغی دووەمی کۆلێژم، ڕاستە یەکەمی پۆلەکە نەماوم وەک ئامادەیی، بەڵام ئێستایش هەر دەردەچم، لەگەڵ خوێندنەکەمدا لە دەرمانخانەی برادەرێکی باوکم ئیشیش دەکەم، باوکم بەو بۆنەوەی لە مێژە

مامۆســـتایە، یەکێک لە تەڵەبەکانی دەرمانخانەی داناوە، ئیتر ئێستا من لەوێ ئیش دەکەم.

دەرمـانخـانەکە، دەرمـانخـانەیەکی زۆر خۆش و نـاوازەیە، لەســـەر شـــێوازێکی ئەورووپیانە دروســـت کراوە، هەمیشـــە خاوێنە و بۆنی خۆشـــە. ســـپی ســـپییە و ڕووناکە، چونکە لە یەکێک لە شـــوێنە هەرە خۆشـــەکانی شـــارەکەماندا دروســـت کراوە کە بەوە ناســـراوە ماڵە دەوڵەمەندەکان لەوێن، ئەوەی ڕاستی بێ تۆزێک دەرمانەکانیشمان گرانترە لە شوێنەکانی تر، چونکە شوێنەکە هیی دەەوڵەمەند و کاربەدەستەکانە.

تەواو لەگەڵ ئیشـــی دەرمان و بازاڕی پزیشـــکی ئاشـــنا بووبووم، ئەو شـــتانەی کە لە ســـەرەتای چوونم بۆ پزیشـــکی بیرم لێ دەکردنەوە وا دیـار بوو وا دەرنەچوون، چونکە هەندێک لەو پزیشکانەی خاوەنی دەرمانخانەکەم ئیشی لەگەڵ دەکردن، لە پێناو ئەوەی کۆمپانیای دەرمانەکە پارەیان بداتێ یان ســـەفەرێکی وڵاتانی تریان پێ بکات، دەرمانی خراپیان بە نەخۆشـــەکان دەدا، بۆم دەرکەوت هەرچەند ڕاســـتە پزیشـــکی ڕزگارکردنی ژیانی خەڵکانی ترە، بەڵام لە هەمان کاتدا تێکدانی ژیانی خەڵکانی تریشـە. زۆر شـتی سـەیر لە دەرمانخانەکە فێر بووم، بەتایبەت کە لەو شـــوێنەی شـــار بووم وا ئەو هەموو خەڵکە دەوڵەمەندەی لێ بوو. بەپێچەوانەی دەرمـانخـانەکانی ناوبازاڕ و گەڕەکەکان کە بیســـتبووم ئەو دەرمانانەی دەبنە

هۆی ئەوەی ژنـان زووتر دووگیـان بن یـان دوانەیـان ببێت، دەفرۆشن، لێرە کۆندۆم زۆرترین فرۆشی هەبوو، ئیتر شەوان لە دوای کاتژمێر نۆوە زۆربەی موشـــتەرییەکان پیاو یان ژن، بۆ کۆندۆم دەهـاتنە دەرمـانخـانەکە. نازانم بۆ، بەڵام وا دیـارە خەڵکە هەژارەکە حەزیان لە منداڵی زیاترە و دەوڵەمەندەکانیش منداڵی کەمتریان دەوێ.

ئەوەی من هەرگیز لە دوای تەواوکردنی قۆناغی یەکەمەوە بیرم لێ نەکردبۆوە ڕووداوە ناخۆشـــەکانی ڕابردووم بوون، من بۆیە ئەم چیرۆکە دەنووســـمەوە و دەمەوێ خەڵـک گوێبیستی بن، چونکە نامەوێ هیچ کەسێک بەو ناخۆشییانەدا تێپەڕێت کە منی پێدا تێپەڕیم... ڕاستە من بیرم لە ڕووداوەکانی ڕابردووم نەدەکردەوە، بەڵام شـــەوێکیان لە دەرمانخانەکە نیو ســـەعات پێش ئەوەی دەرمانخانەکە دابخەم و بگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە، خەیاڵم ڕۆیشـــتبوو، بیرم لەوە دەکردەوە چەند مانگی تر لێرە کـار بکەم دەتوانم ســـەیارەیەک بکڕم، خەیـاڵم تەواو ڕۆیشـــتبوو بۆ ئەو بابەتە، بە جۆرێک تێیدا نقوم بووبووم، ئاگام لەوە نەبوو کە کڕیارێک هاتۆتە ناو دەرمانخانەکەوە، کە وتی سڵاو، من ڕووم لە دەرمانەکان و پشتم لەو بوو، تا خۆی قســـەی نەکرد، هەســـتم نەکردبوو کەســـێک هـاتبێتە نـاو دەرمانخانەکەوە.

کە کڕیارەکە وتی سـڵاو، ڕاستـەوخۆ شـڵـەژام، چونکە زۆر لەناکاو بوو و منیش تەواو لە خەیاڵی خۆمدا ون بووبووم، بەپەلە هەسـتـامەوە سـەرپێ و وتم: «فەرموو، بە خێربێیت، چۆن دەتوانم یارمەتیت...»

پێش ئەوەی قسـەکەم تەواو بکەم ناسـیمەوە، ئەویش کە منی لەناو سـەدرییەیەکی سپیدا بینی، چاوەکانی بە تەواوەتی زەق بوونەوە.

بەڵێ، ئەو کڕیارە بەو نیوە شەوە، شێنێ بوو....

من نەک هەرگیز بە خەیاڵمدا نەهاتووە شـێنێ بۆ دەرمان کڕین بێتە ئەم دەرمانخانەیە، بەڵکو بیرم نایە ئەسـڵەن کۆتا جـار کەی بوو خەفەتم لەو بـابەتە خواردبوو و بیرم لێ کردبۆوە، چونکە من بەتەواوەتی خۆم بۆ خوێندن و کارکردن لە بابەتە پزیشکییەکان یەکلایی کردبۆوە، نە سۆشیاڵ میدیام هەبوو، نە هیچ شتێک تا ئاگادری ئەو دونیا ناخۆشـەی ئەوان بم، بۆیە ئەو شـەوە کە شێنێ لەبەردەم ڕووناکییە سپییەکانی دەرمانخانەکەماندا بە جوانی دەرکەوت و نـاسـیمەوە، ڕێک تووشی شۆکی کردم.

قسـەکەمم تەواو نەکرد، نەموت چۆن دەتوانم یـارمەتیت بدەم، ڕاسـتـەوخۆ وتم: «کاتی دەرمانخانە کۆتـایی هـاتووە، ببوورە هیچ دەرمانێک نافرۆشین، فەرموو بۆ دەرەوە!»

ئەو هیچ قسەیەکی نەکرد، تەنیا وەستابوو و بەحەپەساوی سەیری ناو چاومی دەکرد، ئاگام لێ بوو کە وردە وردە دەلەرزی و چاوی پڕ ئاو دەبوون، تا دەستی کردە گریان، بەلام نە هیچ هەستێکی بەزەییم دەجوولا، نە دەیشمویست هیچ شتێک بڵێم، چونکە کامێرای دەرمانخانەکە هەموو شتێکی ڕیکۆرد دەکرد، ترسم لە بوختان نەبوو وەک جارەکەی تر، تاکە شتێک بیرم لەو کاتەدا لێ دەکردەوە، گریانی دایک و باوکم بوو، کاتێک لە زیندانەکە هاتبوون بۆ لام. تاکە شت سەبارەت بەم کچە لە خەیاڵم بوو، گریانەکانی دایک و باوکم بوون و بەس، کە هۆکارەکەی ئەم کەسە بوو وا لەبەردەممدا وەستاوە و دەیەوێت بە فرمێسکەکانی دووبارە فریوم بداتەوە.

وتم: «فەرموو خاتوون، بۆ دەرەوە، کاتی دەرمانخانە کۆتایی هاتووە، ببوورە دایدەخەین.»

من هەر لە جێی خۆمەوە ئەو قسەم چەند جارێک دووبارە کردەوە و ئەویش تا دەهات زیاتر چاوەکانی گەورە دەبوون و فرمێسک بە ڕوومەتیدا دەهاتە خوارێ و مکیاجەکەی دەموچاوی لێ دەکردەوە.

وتی: «توانا، تۆ لە کوێیت؟ توانا، باوەڕ بە چاوەکانم ناکەم تۆ ئاوا گەورە بوویتە و ئەو جلە سپیانەت لەبەر کردووە، ئێستا ڕێک بە دکتۆرێکی تەواو دەچیت، توانا، نامەوێ بڵێم داوای لێبوردنت لێ دەکەم، چونکە هیچ شتێک لە بابەتەکە

ناگۆڕێت، بەڵێن بێت ئەمە کۆتا جاریش بێت بێمەوە بۆ ئەم دەرمانخانەیە، چونکە نامەوێ ئەوەندەی ژیانتم تێکداوە زیاتر تێکی بدەم، تەنیا دەمەوێت پێت بڵێم دڵنیا بە، من لە ناخی دڵمەوە خۆشــمدەوێیت و ڕۆژێک دێت لەوە تێدەگەیت کە بۆ ناچار بووم ئەو کارە ئەنجام بدەم...»

پێش ئەوەی زیاتر قسـەکانی تەواو بکات قسـەکانم پێ بڕی و وتم: «کۆدۆ هەموو ئەو قســانەی تۆ دەیکەیت پێی وتووم، بۆیە تکـایە واز بێنە و هەرگیز مەگەڕێرەوە، نـامەوێ لە خەوەکانیشمدا بتبینمەوە، فەرموو بۆ دەرەوە...»

شــێنێ ئەو شــەوە بێ ئەوەی بڵێ بۆچی هـاتووەتە دەرمانخانە، بێ ئەوەی منیش لێی بپرسـم، لە دەرمـانخـانەکە بە گریانەوە ڕۆشــتە دەرەوە و دەســـتەکانی لە یەکتر ئاڵاند و ڕۆیشت...

من نەمویسـت مێشـکی خۆمی پێوە مەشـغووڵ بکەم، بۆیە ئەو شــەوە ٢٠ دەقە زووتر دەرمانخانەکەم داخســـت و زۆر بەپەلە گەڕامەوە ماڵەوە...

بۆ سبەی، چووم بۆ زانکۆ، وەک هەموو ڕۆژەکانی تر بوو زانکۆکەم، زۆر دڵم خۆش بوو لێرە دەخوێنم، هەمیشە بیرم لە دایـک و بـاوکم دەکردەوە کە بەهۆی ئەوەی من دەبم بە پزیشــک ئەوان دڵیان چەند خۆشــدەبێت و شــانازیم پێوە دەکەن، بۆیە هەمیشـە لە زانکۆ زەردەخەنە لەسـەر لێوم بوو.

هەر بەبۆنەی ئەو زەردەخەنەیشەوە من بووبووم بە برادەری زۆربەی ئەو کەسانەی لە مەرحەلەکەی خۆمان بوون، لە زانکۆیش لەناو تەلەبەکاندا کێشە زۆر بوون، هەستم دەکرد بابەتی وەک من و شێنییش ڕوویداوە لەناویاندا، چونکە زۆربەی تەلەبەکان منیان بە کەسێکی جێگەی متمانە دەزانی و دەردەدڵیان بۆ دەکردم، هۆکارێکی تریش وای لەوان کردبوو بێن کێشەکانیان لای من باس بکەن ئەوە بوو، من سۆشیاڵ میدیاکانم بەکارنەدەهێنا، بۆیە ئەوان دەیانزانی من ناچم لە نامەیەکدا نهێنییەکانیان بکەمە نوکتەیەک و لە گرووپێکی کوڕانەدا بڵاوی بکەمەوە، ئەو کەسانەی قسەیان لەگەڵ من دەکرد دیار بوون، چونکە هەر لە باخچەی زانکۆکەی خۆمان پێکەوە دادەنیشتین، ئیتر بۆیە شتەکان ڕوون بوون.

هەمیشەش ئەوان خۆیان دەهاتن قسەکانیان بۆ دەکردم، من هەرگیز نەبووە چیرۆکی خۆم بۆ هیچ یەکێکیان باس بکەم، بەڵام ئەوان خۆیان قسەکانیان بە من دەوت، بەسەرهاتی سەیر سەیری تێدا بوو، هەندێکیان کێشەی کوڕ و هەندێکیان کێشەی کچ، هەندێک کێشەی پارە و هەندێک کێشەی دایک و باوکیان.

لە هەموو ئەو چیرۆکانەی تەلەبەکان بۆیان گێڕاومەوە کاریگەرتر، ئەو چیرۆکە بوو کە هێمن بۆی دەگێڕامەوە. هێمن

کورێکی زۆر لەســەرخۆ و باش بوو، کەســێکی چاوتێر و لە خێزانێکی دەوڵەمەندیشەوە هاتبوو، باوکی بازرگانی دەرمان و دایکیشــی دکتۆرە بوو، بەڵام وەک خۆی هەمیشــە بە هەناسە ساردەکانییەوە دەیگوت، «بە چی دەچێ؟» ئەو هەمیشە باسی ئەوەی دەکرد کە لە منداڵییەوە بێبەشە لە نازی دایک و باوکی، تا ئێســتا نانێکیان بە ئیســراحەت بەیەکەوە نەخواردووە، هەمیشــە لەســەر ئەو ســفرەیەی خزمەتکارێک بۆیان ئامادە دەکات، دەبێت بە مناقەشــەی پارە و ســەروەت و ســامان و نانەکەیان لێ دەبێ بە قوزەڵقورت، وەک خۆی دەیگوت...

من نــامەوێ ئەم کتێبەی دەینووســمەوە، جگە لە چیرۆکەکەی خۆم، چیرۆکی ژیانی کەســانی تریشــی تێدا بنووســمەوە، بەڵام بۆیە لەناو هەموو چیرۆکەکاندا باســی چیرۆکەکەی هێمنم کرد، چونکە زۆر کاریگەریی لە ژیانی من کردبوو، هەمیشــە کاتێک دەچوومەوە ماڵی خۆمان و دەمبینی ســەیارەکەی باوکم باشــترین ســەیارە نییە کە لە شــارەکەمان هەیە، بەڵکە ســەیارەیەکی ئاساییە، دەمبینی ناو ماڵەکەیشمان ناوماڵێکی ئاساییە، هیچ خەفەتم لەو شتانە نەدەخوارد، چونکە ئێمە هەمیشە لەسەر سفرە کۆ دەبووینەوە و بەیەکەوە باسی خەونەکانی خۆمانمان دەکرد و بەیەکەوە پێدەکەنیین، من زۆر ســوپاســگوزار بووم بۆ ئەو بابەتە، هەمیشــە نموونەی هێمنم لەپێش چاو بوو...

ڕۆژان هات و ڕۆشتن، لە دەرمانخانەکەم ڕووداوێکی سەیر ڕوویدا، ڕێک لەو کاتەی لەسەر کورسییەکەم لە دەرمانخانەکە هەستام بۆ ئەوەی دایبخەم، واتا ڕێک ١٢ی شەو، کچێک خۆی بە ژووریدا کرد، ڕاستییەکەی نەمدەزانی کچە یان ژنە، بەڵام زۆر گەنج دیار بوو، زۆر پەشۆکاو دیار بوو، پێیش دەچوو ڕایکردبێ، چونکە هەناسەبڕکێی بوو، وتی: «توخوا تکات لێ دەکەم لە شوێنێک بمشارەوە، نەمشاریتەوە دڵنیا بە یان دەمکوژن یان دەمفرۆشن، توخوا کاکە گیان، کاکی دکتۆر، ڕزگارم کە، بمشارەوە بەڵێن بێ هەرچیت بوێ بۆتی دەکەم، بەس ڕزگارم بکە!»

کە ئەو قسانەی کرد، من زۆر زۆر ترسام، هەر یەکسەر بابەتە کۆنەکەی خۆمم بیرکەوتەوە، دەترسام دووبارە بوختانم بۆ بکرێتەوە، بەڵام لەو کاتەدا کە دەموچاوی ئەو کچەم دەبینی چەند بەکوڵ دەگرییەت، نازانم چ شتێک لە ناخمەوە پاڵی پێوە نام بیشارمەوە، خۆشم کە ئێستا بیر لەو بابەتە دەکەمەوە سەیرم پێ دێت ئەو شەوە چۆن ئەو کارەم ئەنجام دا. هەرچۆنێک بێت وتم: «باشە، بەس دەنگت نەیە، لە پشتەوە تواليتێکمان هەیە، بڕۆ ئەوێ، منیش دەرگاکە کلیل دەدەم، بەس دەنگت نەیە و نەگرییەیت!» ئەو کاتە بیرم لەوە دەکردەوە ئەو کچە بە هیچ شێوەیەک ناتوانێ وەک شێنێ بکات، چونکە لە دەرمانخانەکەدا کامێرا هەیە و شایەتی ئەوەیە من هیچ

شتێکم نەکردووە. کە شاردمەوە دوای نزیکەی ٢ دەقەیەک، چەند پیاوێک و دوو کچی تر هاتنە دەرمانخانەکە، پیاوەکان لەو پیاوانە دەچوون کە ئەو شەوە هاتنە ناو شوقەکەی شێنێ و لە منیان دا، هەمان ستایلی جل و بەرگیان هەبوو، هاتنە ژوورەوە و سڵاویان کرد، ئەوان خۆیان وا دەرنەخست کە هاتبن بە دوای کەسێکدا بگەڕێن، تەنها یەکێک لەو کچانەی لەگەڵیان بوو وتی: «دکتۆر گیان، سەرم زۆر دێشێت، ئەگەر ئەزیەت نییە پاراستۆلێکم بدەیتێ زۆر سوپاست دەکەم.» منیش بەبێ هیچ قسەیەک حەبێکم دایە و سەیری پیاوەکان و کچەکەی ترم دەکرد کە بەردەوام سەیری ئەولا و ئەولایان دەکرد، تەنانەت پیاوێکیان لە کاتی پارەدانەکە زۆر هاتە پێشەوە و سەیری بەردەم شووشەکەی پێشمیشی کرد، بۆ ئەوەی ئەگەر من هیچ شتێکم لەژێرەوە شاردبێتەوە، بیبینێت. ئەوان زۆر زیرەک بوون، وا دیار نەبوون هاتبن بۆ ئەوەی کچێک بدۆزنەوە و بیگرن، ئەگەر من کچەکەم لەوێ نەشاردبایەوە، هەرگیز گومانێکی وام لە چەند پیاوێک نەدەکرد کە تەنیا هاتبن پاراستۆلێک بەرن...

دوای ئەوەی ڕۆیشتن، نیو سەعاتی تریش هەر لە دەرمانخانەکە مامەوە، نە من قسەم لەگەڵ کچەکە کرد و نە ئەویش دەیوێرا قسە بکات، من نیو سەعاتێک خۆم تاخیر کرد تا ئەو پیاوانە بەتەواوەتی دوور بکەونەوە، ئینجا بڕۆمەوە

ماڵێ، هەر کە بووە سەعات ١٢ و چارەکێک، دایکم تەلەفۆنی کرد، وتی: «توانا کوڕم، بۆ تا ئێستا دیار نیت؟ خۆ هیچ نەبووە؟» ئاخر من ڕۆژان ١٢ بەڕێ دەکەوتم بۆ ماڵەوە و بە چارەکێک دەگەیشتمەوە، وتم: «نا دایکە گیان، هیچ نەبووە، ئەمشەو نیو سەعاتێک تاخیرتر دەرمانخانەکە دادەخەم، ئێوە بخەون.»

دواتر، سەعات ١٢ و نیو بە کچەکەم وت: «دەرگاکەم کردۆتەوە، وەرە دەرەوە، ئەوانیش لەو ناوە دیار نەماون.» هاتە دەرەوە، هەموو گیانی بووبووە ئارەقە و لە ترسانیشدا میزی بەخۆیدا کردبوو. من نەمدەویست وای دەرخەم بینیومە، هەر هەوڵم دەدا هەست بەوە نەکات، تا تەریق نەبێتەوە، بەڵام ئەو بەو هەموو لەرز و ئارەقەوەی کردبووی، وتی: «زۆر زۆر سوپاست ئەکەم کاک دکتۆر، بە ژیانم قەرزارتم، توخوا تۆ گوێم بۆ ڕاگرە، بە خوا من نامەوێت تێکەڵی ئەمانە بم، من دایک و باوکم نەماون، لای نەنکم دەمامەوە، تا برادەرێکم هات و وتی ئیشت بۆ دەدۆزمەوە، منی بەوانە ناساند، ماوەیەک لە ساڵۆنێک ئیشم کرد، بەڵام ئەمشەو داوای ئەوەیان لێ کردم بچم کوڕێک هەڵبخەڵەتێنم و دواتر داوای پارەی لێ بکەم و هەڕەشەی لێ بکەین، بەڵام قبووڵم نەکرد، چونکە وا پەروەردە نەکراوم شتێکی وا بکەم، کەچی ئەوان هەڕەشەی کوشتنیان لێ کردم.

که ئەم قسانەم بیست، نەمتوانی هیچ شتێک بڵێم، یەکسەر بەبێ یەک و دوو تەلەفۆنم بۆ باوکم کرد و هەموو شتێکم بۆ گێڕایەوە، وتم: «باوکە، نامەوێت وەک جارەکەی ترم لێ بێت، تۆ پێم بڵێ چی بکەم؟ دەری بکەم یان چی؟»

که وام وت، کچەکە زیاتر لەرزی و دەموچاوی سپی هەڵگەڕا، باوکیشم نەیدەزانی چی بڵێ، بەڵام لەبەر ئەوەی هەمیشە لەو کەسانە بوو باوەڕێکی پتەویان بە خودا هەیە و دەیویست یارمەتی خەڵکی بدا، وتی: «کوڕم، بیهێنەوەماڵەوە، ئێمە ئەمشەو ڕایدەگرین، بزانین خوا چ دەکا، دەیدەینە دەست خوا...»

که ئەمانەم بە کچەکە وت، زۆر دڵی خۆش بوو و بەردەوام دەلەرزی، باوکم خۆی بە سەیارە بە دواماندا هات، بۆ ئەوەی کەس بەو نیوەی شەوە ئەو کچە بەو شێوەیە نەبینێت، چوینەوە ماڵەوە و ئەو شەوە تا بەیانی کەسمان نەخەوتین...

ئەو شـــەوە ئەو کچە لە ماڵی ئێمە مایەوە، بەڵام باوەڕ ناکەم، نە من، نە دایـک و بـاوکم بۆ دەقەیەکیش خەو چووبێتە چاومان، چونکە کچێکی لەو شـێوازە کە زۆر زۆر ترسـابوو و نەیشماندەزانی تەنانەت ناویشی چییە، لە ماڵمان بوو. هەستم دەکرد کە دایک و باوکم بە ئەنقەسـت پرسـیاریان لێ نەدەکرد بۆ ئەوەی هیلاک نەبێت، چونکە هەر خۆی زۆر مـاندوو بوو. دایکم مەکسییەکی خۆی دایە کە بۆی زۆر گەورە بوو، چونکە هەموو جلەکانی خۆی تەڕ بووبوون، بەگشتی ئەو شەوە هیچ قسـەیەک نەکرا، چونکە هەر کچەکە دانیشـت، دوای ماوەیەکی زۆر کورت خەوی لێ کەوت.

من و دایـک و بـاوکم ســـەیرێکی یەکترمـان کرد و بـاوکم پەنجەی شـایەتمانی بردە لای دەمییەوە و بە ئاماژە پێی وتین کە بێ دەنـگ بین، لێی گەڕێین بخەوێت، چونکە زۆر هیلاک دیارە.

بۆ بەیانی من هەر کە دەوامم تەواو بوو، بەپەلە گەڕامەوە ماڵەوە، نیوەڕۆ لایدابوو، نزیکی سەعات یەک و نیو گەیشتمەوە ماڵەوە، کە گەیشتمەوە کچەکە هێشتا لەو جێگایەی دوێنێ شەو خەوی لێ کەوتبوو، هەر خەوتبوو، تەنیا ئەوە بوو دایکم بەتانییەکی تریشی پێدا دابوو.

دایکم، کە بەدرێژایی ڕۆژەکە لە ماڵەوە خەریکی خواردن ئامادەکردن بوو، دەیگوت، کچە هەر لە خەویدا قسەی کردووە و هاواری کردووە، بەڵام بۆ یەک دەقەش خەبەری نەبۆتەوەو هەروا خەوتووە! من تا خۆم گۆڕی، بینیم باوکیشم هاتەوە. باوکم بە دایکمی وت هەڵیبسێنێت تا نانێک بخوات و بزانین کێیە و بۆ وای لێ هاتووە، چونکە خۆ ناکرێ لە ماڵی خۆمان ئاوا بیهێڵینەوە، لەوانەیە ئێستا ماڵییان خەمی لێ بخۆن. من دەمزانی ئەو کچە دایک و باوکی نەماوە، بەڵام هیچم نەوت، چونکە دەمویست خۆی باسی بکات.

کە کچەکەیان هەستاند، لەپڕ ڕاپەڕی و سەرەتا ترسا، دوایی بیری هاتەوە لە ماڵی ئێمەیە، وتی: ز«ۆر داوای لێبوردنتان لێ دەکەم، بوومە عەزییەت بۆ ئێوە.» دایکم پێی وت: «نا، قسەی وا مەکە کچی خۆم، بەس هەستە دەست و دەموچاوت بشۆ، با شتێک بخۆین، ئینجا بزانین تۆ بۆ وا حاڵت شێواوە؟ چی ڕوویداوە؟ چۆن وات لێ هاتووە؟»

کچەکە بە دەنگێکی نزم وتی: «زۆر باشــە دایە گیان!» خێرا هەستا و دەموچاوی شوشت، زۆر شەرمیشی دەکرد، چونکە ئەو کاتەی هاتبووە ناو دوکانەکەی من زۆر دەلەرزی و میزیشــی بە خۆیدا کردبوو، باوکم بە دەنگێکی ئارامەوە وتی: «کچی خۆم، شـــەرم مەکە، هەرچی ڕۆی ڕۆی، ئەوەی گرنگە ئەوەیە ئێستا تۆ سەلامەتی، ئێستا وەرە سەر سفرەکە و بۆمان باس بکە بزانین چۆن وات لێ هاتووە!»

بەدەم نان خواردنەوە کچەکە ســەبر ســەبر دەستی بە قسەکردن کرد، بەڵام باوکم پێی بڕی، وتی: جارێ کچی خۆم، پێمان بڵێ ناوت چییە؟ ئینجا دەســت بکە بە گێڕانەوەی چیرۆکەکەت.»

کچەکە وتی: «ناوم ئانیایە و ٢٠ ســاڵم.» ئەنجا وتی: «من باوکی خۆمم نەبینیوە و دایکیشم بەسەر منەوە مردووە، بۆیە ئەویشــم نەبینیوە، هەر لە لای نەنکم بووم و ئەو بەخێوی کردووم...» پاشــان وتی: «با زۆر دوور و درێژی نەکەمەوە، چونکە دەزانم زۆر لە کاتتانم گرتووە...» چاوی پڕ بوون لە فرمێسک و دەیگوت، لە تەمەنی ١٦ ساڵی لە ڕێگەی هەندێک برادەری مەکتەبییەوە دەســتی کردووە بە ئیشــی ساڵۆن ، لەوێ پارەی خۆی کۆ کردۆتەوە و مەسرەفی خۆی لەســەر خۆی بووە. دەیگوت، دوای نزیکەی ســاڵێک لە ئیشکردن لە ساڵۆنەکە نەنکیشــی کۆچی دوایی کردووە کە تاکە کەسی

بووە متمانەی پێی هەبووە و خۆشی ویستووە. هەر کە باسی نەنکی دەکرد، فرمێسک لە چاوەکانی ڕانەدەوەستا، ئێمەیش هیچمان دەستمان لە نانەکە نەدابوو، هەرسێکمان بەوردی گوێمان لێ گرتبوو بزانین چیرۆکەکەی بە کوێ دەگات.

وتی، دوای مردنی نەنکی، مامەکانی هاتوون و خانووەکەیان لێ ستاندووە و فرۆشتوویانە، ئەویش نەیتوانیوە لەبەرانبەریاندا هیچ بکات، بۆیە ناچار بووە داوا لە خاوەنی سالۆنەکە بکات لەوێ بمێنێتەوە و لەبەرانبەردا پارەی کرێ بدات بە خاوەنی سالۆنەکە، ئەویش ڕازی بووە، ئەوەی زۆر دڵی منی توند کرد ئەوە بوو کە وتی، لە دوای مردنی نەنکمەوە وازم لە خوێندنیش هێنا، چونکە دەبوایە لە سالۆن ئیشی زیاتر بکەم بۆ ئەوەی بژێوی ژیانی خۆم دابین بکەم. بۆیە بەناچاری وازی لە خوێندن هێنابوو.

تا ئێرە بەگشتی کێشەکان گەورە نەبوون، بەڵام ئەو کاتەی کچەکە دەستی خستە سەر دەموچاوی خۆی و وتی، لێرەوە کێشە گەورەکانی ژیانی من دەستیان پێ کرد... زانیم لێرەوە باسی ئەو پیاوانەی دوێنێ شەو دەکات!

وتی: «من لە سالۆنەکە ئیشی خۆمم بەڕێکی دەکرد و بە پارەکەی دەژیام، زۆر هەوڵم دەدا پارە کۆ بکەمەوە بۆ ئەوەی تا تەمەنم دەگاتە ١٨ ساڵ بتوانم خانوویێک بۆ خۆم بکڕم،

بەڵام وەک دەبینن ئەوە ٢٠ ساڵم و ئەوەیش حاڵەکەمە، تەنیا ئەوەی هەمە مەکسییەکەی ئەو خاتوونە بەڕێزەیە!»

دواتر وتی: «دوای چەند ساڵ کارکردن لەو ساڵۆنە، بەبێ کێشە فێری زۆربەی شتەکانی ساڵۆن بووم، زۆریشم حەز لێ بوو خۆم دوکانێکی تایبەت بە خۆم بکەمەوە، ئەو کاتە هەم دەتوانم وەک ماڵ بەکاری بێنم، هەم قازانجی زیاتریش دەکەم. بۆیە زۆر هەوڵم دەدا بتوانم شوێنێکی تایبەت بە خۆمم هەبێت. سێ مانگ بەر لە ئێستا لە ساڵۆنەکە، شەوێک کە نزیکی کاتی خەوتنم بوو، لای سەعات ١١ بوو، خاوەنی ساڵۆنەکە بەتوندی لە دەرگاکەی دا و هەر بە کلیلەکەی خۆی دەرگاکەی کردەوە، لەگەڵ دوو پیاو کە قاتی ڕەشیان لەبەر بوو، هاتنە ژوورەوە و کچێکی هاوتەمەنی منیان لەگەڵدا بوو، ڕێک وەک من دەگریا و هەموو گیانی تەڕ بوو. کچەکە هاواری دەکرد: تکایە وازم لێ بێنن، من نامەوێ ئەو کارە بکەم، توخوا وازم لێ بێنن، ئەوان بە پرچ گرتیان و فڕێیان دایە ژوورەوە. خاوەنی ساڵۆنەکە وتی: تۆ بڕۆ ژووری پشتەوە و وا بزانە نە هیچت بینیوە و نە هیچیش دەبیستی، ئەو شتانەی ئەمشەویش بە هیچ شێوەیەک لە بیرت نامینێن، تێگەشتی ئانیا؟!

تا ئەوکات ئەوم وا بە تووڕەییەوە نەبینیبوو، بە ترسەوە وتم: بەسەرچاو، بەسەرچاو. وام زانی ئەو کچە کچی خاوەنی

سالۆنەکەیە و شتێکی کردووە وا وای لێ دەکەن، بەڵام دواتر کە گوێم لە قسەکانیان بوو تێگەشتم مەسەلەکە شتێکی ترە. کچەکەی هاواری دەکرد، ، بەوەیدا کە ژنی خاوەنی سالۆنەکە هاواری بەسەردا دەکرد و جنێوی پێ دەدا، زانیم کچەکە ناوی لیزان بوو، من نامەوێ ئێستا لەبەرانبەر ئێوەدا جنێوەکانی ژنە دووبارە بکەمەوە. پێی دەگوت چەند ساڵە ڕامانگرتووی، وا دەزانی لەبەر چاوی کاڵتە؟ ئەی نابێ دوو ئیشمان بۆ بکەی و دوو دینارمان بۆ پەیدا بکەی؟

پیاوەکان بەردەوام لە کچەکەیان دەدا و قژیان ڕادەکێشا، کچەکەیش هاواری دەکرد و دەیقیژاند، هەر دەیگوت: توخوا ئەو کوڕەم زۆر خۆشدەوێت، ناتوانم ئەو کارەی لەگەڵ بکەم، چیتان دەوێ دەیکەم، بەس واز لەو بێنن.

ئەوانیش هەر زیاتر جنێویان پێ دەدا و لێیان دەدا، تا بۆ ساتێک هەموو شتێک لەناکاو بێدەنگ بوو، کچەکە لە هۆش خۆی چووبووەوە و دوو پیاوەکە هەڵیانگرت و بردیانە دەرەوە، ژنەکەیش هەر لەودیوی دەرگاکەوە بە منی وت: ئانیا، شەوت شاد، وەک وتمان، نە هیچت بیستووە و نە هیچت بینیوە.

من لە ترسی خۆمدا هەر نەمدەوێرا جوابیشی بدەمەوە، لە لایەک بیرم لەوە دەکردەوە ئەگەر لە شوێنەکە دەرم بکات، بۆ کوێ بچم، لە لایەکیشەوە بیرم لە کچە داماوەکە دەکردەوە.

دوای ماوەیەک و سێ ڕۆژ بەر لە ئێستا، شەوێکی تر ژنەکە هاتەوە ساڵۆنەکە، ئەمجارە بە تەنیا بوو، کەسی لەگەڵ نەبوو، هەر خۆی بە سەیارەکەی خۆی هاتبوو، منیش دەرگام لێ کردەوە و زۆر بە خێرهاتنم کرد، دانیشت و قاچی لەسەر قاچ دانا، وتی: ئانیا، گوێ بگرە، ئەوە چوار ساڵە تۆ لای من ئیش دەکەیت و پارەت پێ دەدەم و دەهێڵم لێرە بمێنیتەوە، وایە یان نا؟ منیش هەر دەمگوت وایە، تا کۆتایی قسەکانیشی ناو ناوە دەیگوت وایە یان نا؟ منیش دەمگوت وایە، ڕێزان خان!

ئیتر زۆر هێنای و بردی، لە کۆتاییدا بۆم دەرکەوت دەیەوێت کاری لەشفرۆشیم پێ بکات، ئەو دەیگوت، دەبێ بچیتە کافتریا تێکەڵاوەکان و خۆت جوان بگۆڕیت و سەرنجی کوڕێک کە هەست دەکەی دەوڵەمەندە بۆ خۆت ڕابکێشیت، دوای ئەوە ئێمە شوقەیەکت دەدەینێ، دەیبەیتەوە ماڵی خۆت و ئێمەیش پیاو دەنێرین تا بیگرن، خەمت نەبێ ناهێڵین دەستت لێ بدات، تەنیا ئەوەیە دەیگرین و دەڵێین مەسەلەکە شەرەفە، بۆ ئەوەی کەس نەتوانێ بڵێ وا نییە، ئیتر بەو بۆنەیەوە پارەی زۆری لێ دەستێنین.

کە ڕێزان خان ئەو قسانەی دەکرد، تێگەیشتم ئەو کچەی پێشتر هێنایان بۆ ساڵۆنەکە و لێیان دەدا هەمان کاریان پێ دەکرد، بەڵام دیار بوو بەڕاستی کوڕەکەی خۆشویستووە و نەیتوانیوە کارێکی وای لەگەڵدا بکات، من ئاگام لەو نەمابوو،

بەڵام تێگەیشـــتم ئەگەر کارەکە ڕەت بکەمەوە بە دەردی ئەو کچەم دەبەن، ئەوەندەم لێ دەدەن تا لە هۆش خۆم دەچم.

زۆر دەترســام و نەمدەوێرا هیچ قســەیەک بکەم، بە ڕێزان خانم وت بیری لێ دەکەمەوە، با یەک دوو ڕۆژ کاتم بداتێ. دوای یەک دوو ڕۆژ بڕیارم دا لە ســاڵۆنەکە ڕا بکەم، ســەعات هەشــتی شــەو بوو، تەنیا یەک جانتام لەگەڵ خۆمدا هێنا و لە ساڵۆنەکە هەڵاتم، جانتاکەم هەموو پارەکانمی تێدا بوو کە لەو چوار ســاڵەدا کۆم کردبوونەوە، بەڵام کە لەســـەر ڕێگا منیان بینی، ناســییانمەوە و دوام کەوتن، بۆیە ناچار بووم جانتاکەم فڕێ بدەم تا بتوانم خێراتر ڕا بکەم، ئەوان سـەیارەیان پێ بوو، بۆیە ڕام کردە نـاو کۆڵانەکـان و جـانتـاکەمـم فڕێ دایە کەلاوەیەک کە پێنەدەچوو کەســـی لێ بژێت بۆ ئەوەی دواتر بیهێنمەوە...

ئەو شــەوە زیاتر لە ســەعاتێک ڕام دەکرد و نەیشــمدەزانی ئەوان لە کوێوە بە دوامەوەن، تـا ئەو کـاتەی خۆم کرد بە دەرمـانخـانەیەک کە تۆی لێ بوویـت و هـاتمە ئێرە... توخوا... زۆر داوای لێبوردن دەکەم، دەزانم ژیـانم لێ تێکداون، بەس بڕوا بکەن هیچ شتێک لە دەست خۆمدا نەبووە!»

لەو قسانەدا بوو لە قسەکردن وەستا و سەیری دەموچاوی ئێمەی کرد، دایکم دەســتی کردبووە گریان و من و باوکیشــم شــۆک بووبووین، چونکە بە پێی قســەکانی ئەو بێت، لێزانی

هاوڕێیشم، ئەوەی پێشتر ناسیبووم، ئەو کچەیە کە ئەو باسی دەکرد و لەگەڵ کۆدۆدا ڕای کردووە، بەڵام من ئەوەم بۆ ڕوون نەبۆوە کە لیزان لە شـــارێکی ترەوە هـاتبوو، چۆن ئـانیـا دەیناسێت، هەرچۆنێک بێت، لەو کاتەدا من بیرۆکەی ئەوەم بۆ دەهات کە شـێنێیش سـەر بە هەمان بابەتە و بەزۆر کارەکەی پێ کراوە. ئەو کاتە نەمدەزانی چ هەسـتێکم هەبێت، هەست بە پەشیمانی بکەم یان کارێکی ڕاستم ئەنجامداوە کە شێنێم بەو شـێوازە بەجێهێشـتووە، بەڵام جارێ کاتی ئەو بیرکردنەوانە نییە...

باوکم بە ئانیای وت: «ئەگەر ئێستا بچین، دەتوانی کەلاوەکە بناسـیتەوە و پارەکانت بێنییەوە، چونکە پارەکانت زۆر گرنگن بۆ ئەوەی بتوانی بژییەیت.»

وتی: «بەڵێ، بەڵێ مامە، دەتوانم بیاندۆزمەوە، بەس توخوا نامەوێ عەزیەتی ئێوە بدەم!» باوکم وتی: «هەسـتە کچم، عەزیەت نییە، چارەیەکیش لەو کێشـەیەی تۆ دەکەین، هیچ شـتێک نییە چارەسـەری نەبێت، خوا هاوکار بێت ناهێڵم کەس دەستت لێ بدا، با بڕۆین...»

ئانیا و باوکم بەڕێ کەوتن و هەر زوو دوای سـەعاتێک، گەڕانەوە، گەڕانەوە و جانتایەکی پەمەییان پێ بوو، بەهۆیەوە ئانیا تەواو دەموچاوی گۆڕابوو و ترسـەکەی نەمابوو، دیار بوو پارەکانی هەموو تێدا بوون و کەس دەستی لێ نەدابوون.

بەڕاستی ئێمە نەماندەزانی چی بکەین و پێویستە لەگەڵ ئانیا چۆن قسە بکەین، چونکە ئێمە یەکتریمان نەدەناسی، دواتر ئێمەیش خۆمانمان پێ ناساند و ئیتر دایکم چوو و هەر بە پارەکانی خۆی هەندێک جلی بۆ کڕی، ئەویش وردە وردە شێوەی کەسێکی ئاسایی وەردەگرتەوە.

پێم سەیر بوو دایک و باوکم بەو شێوەیە لەگەڵی باش بوون، چونکە ئەو شێوەی لەو کچانە نەدەچوو کە باوک و دایکم حەزی پێ بکەن، کەچی بە پێچەوانەی بیرکردنەوەکانی منەوە دایک و باوکم لەگەڵیدا زۆر باش بوون.

هەر بۆ ئێوارەی ئەو ڕۆژە، هەموومان بە یەکەوە قسەی زیاترمان کرد، ، هیچ کاتێک نەبوو ئەو بەتەنیا قسە لەگەڵ یەکێکماندا بکات، من و دایک و باوکم بەیەکەوە قسەمان لەگەڵی دەکرد، باوکم لێی پرسی بەتەمای چییە؟ پلانی چییە؟ ئایا دەیەوێت پۆلیس لە بابەتەکە تێبگەیێنێت یان نا؟ ئەویش هەر کە ئەو قسانەی باوکمی بیست، خێرا وتی: «نا، نا، تخوا نا، پۆلیس نا!» وتمان: «ئێ بۆ نا؟ لەوانەیە باشترین شت بێ، ئەوان هێزیان هەیە، دەتوانن ئیشەکە چارەسەر بکەن.» وتی: «ئاخر خۆ خۆیشم هەر لە سەرەتاوە ئەوەم دەزانی، بەڵام یەکێک لە کچەکان، کە دواتر من هەر لە ڕێگەی خاوەنی ساڵۆنەکەوە زانیم، چووبوو شکاتی لێ کردبوون، بە حسابی خۆی ئەوان بگیرێن، کەچی خۆیان گرتبوو، تا ئیستایش کەس

نازانێت سەر و سۆراغی چییە و بزر بووە! ئەوان دەڵێن خودی پۆلیسیش دەستی لەگەڵیان تێکەڵ کردووە، چونکە ئیشەکە لە ماوەیەکی کەمدا پارەیەکی خەیاڵی قازانج دەکات، بۆیە هەموویان وەک باندێکن، تکایە مەمدەنە دەست پۆلیس، چیتان دەوێت بۆتانی دەکەم...»

دایک و باوکم سەیرێکی یەکتریان کرد و هیچیان نەوت، باوکم وتی: «باشە، جارێ ئەم ماوەیە لە ماڵی ئێمە بمێنەوە، تا بزانین خودا دەرگایەکمان لێ دەکاتەوە، بەڵام ئاگادار بە هەر هەڵەیەکی بچوکیشت لێ قبوڵ ناکەین، چونکە ئێمە پێشتر باجی کارێکی هاوشێوەمان زۆر بە قورسی داوە، بۆیە ئاگاداری کردەوەکانت بە.» بەو قسەیەی باوکم ئانیا یەکسەر چاوی پڕ بوو لە گریان، منیش پێم سەیر بوو باوکم قسەیەکی وا ڕەقی کرد، بەڵام باوکم درێژەی پێ دا و وتی: «کچی خۆم، دەزانم تۆ کچێکی گەنجیت و بەو تەمەنە کەمەوە نارەحەتی زۆرت چێشتووە، بەس دەبێ تۆیش لە ئێمە تێبگەیت کە نامانەوێت خێزانەکەمان -بەهۆی چاکەیەکی خۆمانەوە کە تەنها لەبەر خودا ئەنجامی دەدەین- تێکبچێت. ئەی وا نییە کچی خۆم؟»

ئەویش کە لێوی تەتەڵەی دەکرد، وتی: «با بابە گیان، وایە، تەواو، خەمت نەبێ، بە خوا هیچ هەڵەیەک ئەنجام نادەم، دەزانم هەموو چێشتێکیش ئامادە بکەم، دەزانم ماڵ پاک

بکەمەوە و قاپ بشۆم، پارەی خۆیشم هەیە، دڵنیا بە ئەرکتان قورس ناکەم، بەس بمپارێزن و مەهێڵن بمدۆزنەوە!»

لەو شەوەوە ئانیا بوو بە بەشێک لە ماڵەکەی ئێمە، بەڕاستی من باوەڕم نەدەکرد کەسێک بتوانێت بەو شێوەیە خۆی لەگەڵ خێزانێکی نەدیو و نەناسیودا بگونجێنێت، هەر بۆ ماوەی ٢-٣ ڕۆژ بەتەواوی وەک یەکێک لە خێزانەکەی ئێمەی لێ هات، قاپەکانی دەشوشت و ماڵەکەی پاک دەکردەوە، تەنانەت هەموو کات کە من لە زانکۆ دەهاتمەوە بەبێ ئەوەی هیچ کام لە دۆلابەکانی ژوورەکە بکاتەوە، ژوورەکەمی ڕێکدەخست، هیچ کات دەستی لە هیچ شتێکی تایبەت نەدەدا، تەنیا جێگاکەمی ڕێکدەخست و شتەکانی لە جێگای خۆیان دادەنا و گسکی دەدا.

منیش ئەم بابەتەم لای هیچ کەسێک نەدرکاندبوو و باوکم چەندین جار ئەوەی دڵنیا کردبۆوە کە نابێت ئەم بابەتە لای هیچ کەسێک بدرکێنم.

ڕۆژان هاتن و ڕۆیشتن، ئانیا تا دەهات زیاتر لەناو شێوازی مامەڵەکردنی خێزانی ئێمەدا دەتوایەوە و ڕەنگی ئێمەی دەگرت، هەر دوای یەک دوو هەفتە، ڕای خۆی لەسەر بابەتە پەیوەندیدارەکان بە دیکۆری ماڵەکەوە دەگوت، دایکیشم زۆر

پـاڵپشـــتی دەکرد و بەیەکەوە کـاریـان دەکرد، قژی دایکمی بڕیبوو و ســـتایلێکی نوێی پێ دابوو، لە یادی هاوســـەرگریی دایک و باوکم ئەو کارەی کردبوو، بۆیە کە باوکم ئەو ڕۆژە لە ئیش گەڕایەوە و بینی مـاڵەکە وا ڕازاوەتەوە و دایکم بەو شـێوەیە قژی چاککراوە، زۆر زۆر دڵی خۆش بوو، من و ئانیا لە ژورەکەی منەوە ســـەیرمـان دەکردن کە بـاوکم چۆن بە چـاوێکی بریســـکەدارەوە ســـەیری دایکمی دەکرد. دیکۆری مـاڵەکە و قژە تـازەکەی دایکمی زۆر بەدڵ بوو، دایکمی بەتوندی لە بـاوەش گرت و مـاچی نێوچاوانی کرد... کە ئەو دیمەنەمان دیت دەرگاکەمان داخست و بەیەکەوە بەبێ دەنگی لە ژوورەکە دانیشـــتین، هەردووکمـان ســـەیری نـاو چـاوی یەکتریمـان دەکرد، دوای چەند هەفتەیەک بۆ یەکەم جار بوو بەو شێوە سەیرە ئانیا ببینم، هەستێکی سەیر بوو، ئەو ڕۆژە زۆر جوانتر و وەک ژنێکی مەرد لە پێش چاوم دەردەکەوت!

دوای ئەو ڕۆژەی یادی هاوسەرگریی دایک و باوکم، شتەکان لە ماڵی ئێمە زۆر گۆڕان، ئانیا زۆر زیاتر لەگەڵمان تێکەڵ بوو و هەوڵی دەدا ماڵەکەمان خۆشتر بێت. باوک و دایکیشم تا دەهات ئەویان زیاتر خۆشدەویست، هەم لەبەر ئەوەی کەسێکی ڕێکوپێک و زمانپاراو بوو، هەم لەبەر ئەوەی کەسێک بوو کە هەر بەڕاستی دەیویست ماڵەکەمان برازێنێتەوە، ڕۆژێک کە من لە دەوام بووم و باوکیشم بەهەمان شێوە، تەلەفۆنێکم بۆ هات، ئانیا بوو، بە گریانەوە هاواری دەکرد بگەڕێمەوە ماڵەوە، دایکم لە قادرمەکان بەربۆتەوە و لە هۆش خۆی چووە، من کە ئەو قسانەی کرد گوێم ڕانەگرت بزانم دوای ئەوانە چی دەڵێ، خێرا مۆبایلەکەم لە گیرفانم نا و ڕامکردە دەرەوە، لە زانکۆ دەرچووم و بەپەلە چوومەوە ماڵەوە، تا من گەیشتم بینیم ئیسعاف لە پێش ماڵەکەمان وەستاوە و ئانیا بە گریانەوە دەستی دایکمی گرتووە و کارمەندەکانی تەندروستی دەیبەنە ناو ئیسعافەکەوە. ئەوەی بەلامەوە سەیر بوو ئەوە بوو دایکم هۆشی هەبوو و

هەر هـاواری قـاچـی دەکـرد، بەپەلە ڕامـکـردە لایـان و بە کارمەندەکانم وت خوێندکاری پزیشـکیم و دەبێ لەگەڵیان بم، ئانیایش بە هەمان شـێوە ویسـتی بێ، بەڵام ڕێک لەو کاتە باوکم گەیشتەوە ماڵ و وەزعەکەی بینی، پێش هەموو شتێک دەسـتی ئانیای گرت و بردییەوە ژوورەوە، هەر ئەوە ڕوویدا و ئێمە بۆ نەخۆشـخانە بەڕێ کەوتین، من لەناو ئیسـعافەکەدا تاکە شتێکی لە خەیاڵم بووبێت ئەوە بوو دایکم سەلامەت بێت، هەر دەمپرسـی: «دایکە، چۆنیت؟» تەنیا هاواری قاچی دەکرد و لەتاو ئازاردا هیچ شـتێکی تری بۆ نەدەوترا، زۆر دڵم تەنگ بووبوو بۆی. پێشتر لە نەخۆشخانە نەخۆشی لەو شێوەیەم بینیبوو، بەڵام کاتێک کەسێکی نزیکی خۆت نەخۆش دەکەوێت ئەو کاتە هەست بە ئازاری هەموو نەخۆشەکانی تر دەکەیت و دەزانیت حاڵیان چۆنە. کە گەشـتینە نەخۆشـخانە سـوپاس بۆ خوا پزیشـکێکی خۆمان لەوێ بوو کە لە زانکۆیش دەرسـمان پێ دەڵێت و منی دەناسـی، خێرا بە دەممانەوە هات و پرسـیی: چی بووە؟ پێم وت دایکم لەسـەر قـادرمە بەربۆتەوە. خێرا نـاردی ئەشـیعەیەکی بۆ بگرن و سـەیرێکی کرد، چۆکی ئەسـتوور بووبوو، پێمی وت: «هیچ نییە، پێناچێت هیچ شـکانێکی هەبێت. ئەگەر وەرگەڕان بێت، ئەوا باشـتان کردووە هێناوتانە ئێرە، ئێسـتا خۆم بۆی چاک دەکەمەوە، ئەگەر شکاوییش بێت، ئەوا دەبێت لە گەچی بگرین.»

ماوەیەک چاوەڕێمان کرد تا ئەشـیعەکە گیرا و هاتەوە، سوپاس بۆ خوا وا دیار بوو هیچ شوێنێکی دایکم نەشکاوە، تەنیا عەزیەتی خواردووە و قاچی وەرگەڕاوە. هەر لەوێ دکتۆرەکە سەبارەت بە من لە زانکۆ، لەگەڵ دایکمدا دەستی بە قسە کرد، من تووشی شۆک بووبووم کە دکتۆرەکەمان بەو شێوازە لەگەڵ دایکمدا قسەی دەکرد و درۆی دەکرد، چونکە ئەو باسی ئەوەی دەکرد گوایە من لە زانکۆ بەردەوام خەریکی قسەکردنم لەگەڵ کچاندا و پێدەکەنم و ئەو بابەتانە! دایکیشم کە گوێی لەو قسانە بوو، زەردەخەنەیەکی کرد و هەر ڕێک لەو کاتەدا دکتۆرەکە جووڵەیەکی لەناکاوی بە چۆکی دایکم کرد و دایکم هاوارێکی کرد، ئینجا وتی: «الحمد للە، دکتۆر ئەوە چیت کرد؟ خۆ ئازارەکەم نەما!»

دکتۆرەکەیش وتی: «ئەوە دایکی توانا، ئەو قسانەی دەمکردن تەنیا بۆ ئەوە بوو سەرنجت بۆ بابەتێکی تر ڕاکێشم تا ئازارەکەت لە بیر نەمێنێت و ئەو جووڵەیە بکەم و قاچت چاک بکەمەوە، دەنا توانا لەو جۆرە کوڕانە نییە، خوا هەڵناگرێ کوڕێکی زۆر ڕێکوپێکە.» ئەوکاتە لە خۆشیی ئەوەیدا هەم دایکم سەلامەت بوو و هەم دکتۆرێکیش بەو شێوەیە باسی دەکردم و متمانەی پێم بوو، دەمم کرابۆوە و پێدەکەنیم. دوای ئەو شتانە، دایکم وتی: «کوڕە توانا، خێرا تەلەفۆن بۆ ماڵەوە بکە با بزانن باشم و هیچ نەبووە، خۆ ئەو کچە خۆی کوشت

ئەوەندەی بگرییەت، هەر پشتی شکا فەقیرەی کە منی هێنایە دەرەوە و هەڵی گرتمەوە.»

خێرا تەلەفۆنێکم کرد، ئانیا کە هەڵیگرت هەر دەگریا، وتم: «هیچ خەمت نەبێ ئانیا گیان، دایکم سەلامەتە و شوکر بۆ خوا هیچ شتێکی وا نییە، تەنیا عەزییەتی بینیوە، دکتۆر وتی چەند رۆژێک ئیسراحەت بکات چاک دەبێت.» ئەویش زۆر بەسەیری دەنگی بەرز کردەوە و وتی: «تخوااا؟ وەڵلا زۆرم پێ خۆش بوو، دە با لەوێ ئیسراحەت بکا، تا دێنەوە خواردن حازر دەکەم.» ئەو قسانەی کرد و تەلەفۆنەکەی داخستەوە، هەر دوای تۆزێک دکتۆرەکە هاتەوە لامان و وتی: «دایکت کاتی رووداوەکە لە هۆش خۆی چوو؟» وتم، من لەوێ نەبوومە، بەڵام تەلەفۆنیان کرد کە بەڵێ لە هۆش خۆی چووە. هەندێک پرسیاری تری کرد، ئایا رشاوەتەوە یان هیچ شتێکی تری بەسەر هاتووە؟ دایکم خۆی وەڵامی دایەوە و وتی نەخێر. دکتۆر وتی: «مادام لە هۆش خۆی چووە، پێم باشە فەحسێکی تریشی بۆ بکەین، سی تی سکانێکە بۆ ئەوەی دڵنیا بین کە لە کاتی بەربوونەوەکەدا هیچ شتێکی خراپ بەسەر مێشکیدا نەهاتووە.»

من لەوێ زۆر دڵم دەترسا و نەمدەزانی چی بکەم، لەو قسانەدا بووین باوکیشم گەیشتە نەخۆشخانە، دایکمیان برد

بۆ ئەوەی ئەو فەحسـەی تری بۆ بکەن و وتیان دەبێ شـەش سەعاتی تر لێرە بمێنیتەوە، چاودێری بکرێت.

من زۆر دودڵ بووم و دەترسام، نەیشمدەزانی چی بکەم و چی بڵێم، چونکە جـاری زۆر زوو بوو بۆ من، من تـازە مەرحەلە دوو بووم، ئەو شـتانەم نەدەزانی... هەرچۆنێک بێت دوای سـەعاتێک شـتێکی وا نەبوو و دایکم وردە وردە باشـتر دەبوو، دواتر دووبـارە ئـانیـا کە بەتەنیـا لە مـاڵەوە بەجێمـان هێشتبوو، تەلەفۆنی بۆ کردمەوە و دەیگوت بۆچی نەهاتنەوە؟ خۆ هیچ ڕوووینەداوە؟ منیش وتم، نا، بەڵام پێویسـتـە تا ئێوارە لێرە بین بۆ ئەوەی دڵنیا بین هیچ شـتێکی خراپ ڕوووینەداوە، خێرا وتی: «باشــە، من خۆم خواردن بۆ دایە دێنم. باش؟» من وتم: «نەخێر ئـانیـا، تۆ مەیە دەرەوە، خۆمـان ئەگەر شـتێک پێویست بێت بۆی دەکڕین.»

ئەو شـەش سـەعاتەی دکتۆر داینابوو وەک شـەش مانگی لێ هاتبوو، سـوپاس بۆ خودا هیچ شـتێکی ئەوتۆ نەبوو و دوای ئەوە چووینەوە ماڵەوە. کە چووینەوە ماڵەوە و دایکمان بردە ژوورەوە، ئـانیـا هەر لە حەوشـەدا بوو، خێرا هـات و باوەشـی بە دایکمدا کرد و دەسـتی کردە گریان، من و باوکم تووشـی شـۆک بووبووین، نەماندەزانی ئەمە هەر بەڕاسـتی ئەوەندەی خۆشـدەوێت یان تەنیا دەیەوێت خۆی لای دایکم خۆشـەویست بکات! بەڵام گریانەکەی ئەوەندە بەکوڵ بوو، لە

شـتێکی درۆیینە نەدەچوو. چووینەوە ماڵ و دانیشـتین، ئانیا هەموو شتێکی ئامادە کردبوو، تەنانەت سوپێکیشی بەتایبەت بۆ دایکم ئامادە کردبوو. دوای ئەوانە هەموو شتێک باش دیار بوو، بەڵام دایکم چۆکی هەر دەهێشـــا و دکتۆر پێی وتبوو پێویســـتە چەند ڕۆژێک ئیشـــی ماڵەوە نەکات و ئیســـراحەت بکات. کە ئێمە ئەو قســـانەمان دەکرد، ئانیا هاتە جواب و وتی: «بەخوا ناهێڵم تا حەفتەیەکی تر دەســت لە هیچ شـتێک بدات، ئەوە نییە منیش لێرەم، خۆ نـابێ لەو مـاڵەدا بەس بخۆم و بخەوم، ئەی نابێ هەندێکیش ئیش بکەم؟ ئیتر خۆم ئیشـەکانی ماڵەوە دەکەم، ئێوە هیچ خەمی ئەوەتان نەبێ.»

چەنـد ڕۆژێـک تێپەڕی و دایکم قـاچەکـانی بـاش بوون، ئەســـتورییەکەیـان نەمـا و ئازارەکەیشـــیـان نەمـا، دایکم کە هەســـتـایەوە و بینیی مـاڵەکەمـان وەک پێشـــترە و بگرە خاوێنتریشـــە، زۆر دەســـتخۆشـیی لە ئانیا کرد کە ئەم ماوەیە تەواوی ئەرکی ماڵی گرتۆتە ئەستۆ.

ڕۆژێک دواتر کە لە دەوام هاتمەوە، ئانیا بانگی کردم، وتی: «ئەمڕۆ شـتێکی سـەیر ڕوویدا توانا!» وتم: «چی بووە؟» وتی: «بـاوکـت زۆر زوو لە دەوام هـاتەوە و لەگەڵ دایکتـدا وتیـان دەچینە دەرەوە، پێیشـــیـان نەوتم دەچن بۆ کوێ، دەبێ چی بکەن؟ توخوا من زۆر دەترســـم!» منیش پێم وت: «لە چی ئەترســـی ئانیا؟ هیچ نییە، لەوانەیە شـتێک بکڕن یان لەوانەیە

سـەردانی هاوڕێیەکیان بکەن، ئێمە با لە خۆمانەوە یەکسـەر بڕیار نەدەین.» ئێمە لەو قسانەدا بووین دەنگی دەرگاکە هات، دایکم و باوکم هاتنە ژوورەوە، هەردووکیان زۆر دڵخۆش دیار بوون و زەردەخەنە لەسەر لێویان بوو، باوکم ویستی دەست بە قسە بکات، وتی: «توانا...!» بەڵام دایکم یەکسەر پێی بڕی و وتی: «توانا، بۆ ئانیا ناکەیە ژنی خۆت؟»

کە دایکم ئەو قسـەیەی کرد، باوکم پێدەکەنی و من و ئانیایش تووشـی شـۆک بووین، کەسـمان هیچ قسـەیەکمان نەکرد، من ئـارەقەم کرد و سـوور بوومەوە و نەمزانی لە شـەرماندا بۆ کوێ بڕۆم، ئاخر ئەو شـتەی باسـیان کرد زۆر لەنـاکـاو بوو، نەمـدەزانی بڵێم چی، پێش ئەوەی ئێمە هیچ شـتێک بڵێین، دایکم درێژەی دایێ و وتی: «دەی دەی، خۆتان تەریق مەکەنەوە، جارێ تۆ توانا، وا دەزانی گوێم لێ نەبوو لە نەخۆشـخانە کە تەلەفۆنت لەگەڵ ئانیا کرد، وتت (ئانیا گیان)؟ ئینجا ئانیا، بە خوا خۆیشت توانا دەناسی، نەڵێم کوڕی خۆمە، کوڕێکی قۆز و ڕێکوپێکە، دەبێتە دکتۆریش و کوڕێکی ئیشـکەریشـە، دڵنیام بەیەکەوە دوانەیەکی زۆر جوانتان لێ دەردەچێت!»

جارێ من و ئانیا هەر لە حاڵەتێکی شۆکدا بووین، باوکیشم دەستی بە قسە کردن و وتی: «بەڵێ کوڕی خۆم، من و دایکت ئەوڕۆ بۆ ئەوە چووبووینە دەرەوە تا لەسـەر ئەم بابەتە قسە

بکەین، جا بێگومان بڕیاری کۆتایی لە دەســـت خۆتاندایە، پێم باشـــە بەتەنیـا بچنە ژوورەوە و بەیەکەوە قســـە بکەن و مـاوەیەک بیری لێ بکەنەوە، بزانن ئـایـا لەگەڵ یەکتری دەگونجێن یـان نـا، چونکە خۆتـان دەزانن هـاوســـەرگری پرۆســـەیەکی قورســـە و بەرپرســـیاریێتیی زیاترتان دەخاتە ســـەرشـــان، من و دایکیشـــت پێمان باشـــە بۆ یەک بن، هەردووکتـان ڕێکوپێکن، حەزیشـــمـان لێیە هەر لەم ماڵەدا لەگەڵ خۆماندا بمێننەوە و وەک ئێســـتا بەخۆشـــی بەیەکەوە بژیین، ئیتر نازانم خۆتان ژی دەڵێن؟ ئەگەر دایکت بهێڵێ، ڕای خۆتان بڵێن، بزانن پێتان چۆنە؟»

هەر باوکم قسەکانی تەواو کرد، ئانیا یەکسەر هاتە جواب و وتی: «من هیچ کێشـــەیەکم نییە، من تا ماوم ســـوپاســـگوزاری ئێوەم و ئێوەم وەک دایک و بـاوکی خۆم دانـاوە، ئیتر ئەگەر هەر بەڕاســـتییش ئێمە ببین بە خێزانێک، من هیچ کێشـــەیەکم نـابێت و بەڵکو زۆریشـــم پێ خۆش دەبێت، جـا بزانم توانـا گیانیش دەڵێ چی!»

جا کە ئانیا بە دەنگێکی جیاواز لەو دەنگەی پێشـتر قسـەی پێ دەکرد وتی توانا و گیانیشی بەدوادا هێنا، هەستێکی سەیرم بۆ دروســـت بوو، بۆیە وتم: «دایە، بـاوکە، من پێم وایە ئەم بابەتە پێویستی بە بیرکردنەوەی زیاترە و من و ئانیایش دەبێ بەیەکەوە بەتەنیا قسەی زیاتری لەسەر بکەین، ئەی وا نییە؟»

باوکم وتی: «بێگومان کوڕم، ئێمە خۆمان ئەم نیوەڕۆیە هەر بەتەمابووین بڕۆینە دەرەوە، جا ئێوە بەتەنیا بەجێ دێڵین قسەی خۆتان بکەن و دوایی ئێوارە کە هاتینەوە، وەڵامێکمان بدەنەوە، ئەگەر کرا ئەوە باشە، هەر لەناو خۆماندا بە ئاهەنگێکی بچووک کۆتایی بە شتەکە دەهێنین، ئەگەریش ڕێک نەکەوتن، ئەوە خۆ هیچ نەبووە و زۆر ئاساییە، وەک پێشتر بەیەکەوە دەژیین.»

جا پێش ئەوەی ئەوان بڕۆنە دەرێ، دایکم ئاوڕێکی دایەوە و بە زەردەخەنەوە وتی: «کوڕم، ئاگاتان لە خۆتان بێ، ئەوەندەی ئێمە لێرە نیین، کەتن و شت نەکەن!»

ئانیا لەژێر لێوییەوە پێدەکەنی و منیش دووبارە سوور بووبوومەوە و نەمدەزانی چی بڵێم، خوا خێری باوکم بنووسێ وتی: «دە ژنەکە لێیان گەڕێ، بۆ ئەوەندە تەریقیان دەکەیەوە؟!» ئیتر ئەوەیان وت و ڕۆیشتنە دەرەوە.

من و ئانیا بەتەنیا ماینەوە، ئەوەی ڕاستی بێ، نەمدەزانی چۆن قسە بکەم و چۆن دەست پێ بکەم، چونکە ڕاستە پێشتر چەند جارێک بە چاوێکی جیاوازەوە سەیری ئانیام کردبوو، بەڵام هەرگیز بیرم لەوە نەدەکردەوە بیکەم بە هاوسەری خۆم، بۆیە بۆ من شتێکی زۆر لەناکاو بوو.

چووینەوە ژوورەوە و بەیەکەوە لەبەرانبەر یەک دانیشتین، ئەو دەستی بە قسە کرد و وتی: «توانا گیان، گوێ بگرە، هیچ

زەخت لە خۆت مەکە، ڕاستە من یەکسەر بە داواکەی دایک و باوکت ڕازی بووم، بەڵام بڕیارەکە لە دەست تۆدایە، من قەرزاری ئەوانم کە منیان وەک کچی خۆیان لێرە هێشتووەتەوە و تا ماویشم قەرزاری تۆم کە منت ڕزگار کردووە، شتێکی زۆر ئاساییە ئەگەر منت نەوێ، هەر پرسیارێکیشت هەیە دەتوانی لێمی بکەیت، یان هەر شتێک هەیە تا ئێستا پێت نەوتووم، ئەوا دەتوانی بێ دوودڵی پێمی بڵێیت.»

من سەرەتا دەمم تێک دەئاڵا و نەمدەزانی چی بڵێم، بەڵام دوای کەمێک خۆم کۆ کردەوە و وتم: «ئانیا گیان، ئەوەی ڕاستی بێت تۆ هەموو شتێک دەربارەی خێزانەکەمان دەزانیت و باوەڕ ناکەم شتێک هەبێت نەیزانیت، تەنیا یەک نهێنی دەربارەی ژیانی من هەیە نایزانیت، ئیتر من ئەو شتەت پێ دەڵێم، ئەگەر دوای زانینی ئەو نهێنییەش هەر منت قبووڵ بوو، ئەوا بێگومان منیش بە تۆ ڕازیم و زۆریش خۆشحاڵ دەبم لەگەڵ تۆدا بژیم، کە کەسێکی زۆر چالاک و خوێنشیرین و زیرەک و بەڕێزیت و هەوڵ دەدەیت لەسەر پێیەکانی خۆت بوەستیت.»

وتی: «چییە توانا؟ پێدەچێت شتێکی زۆر گەورە بێت!»

وتم: «بەڵی زۆر گەورەیە...» ئیتر پێش ئەوەی ئەو هیچ قسەیەکی تر بکات، تەواوی بەسەرهاتەکەی خۆم و شێنێم بۆ

گێڕایەوە تا ئەو کاتەی کە گیرام و ئازاد کرام و خانووەکەم بۆ دایک و باوکم کڕییەوە

گورج دەستی کردە گریان و زیاتر لێم هاتە پێشەوە و لە باوەشی کردم، وتی: «توانا، من ڕازیم و لە هەموو قسەکانت بەتەواوی تێدەگەم. خۆزگە شتێکی وا ناخۆش بەسەر کەسێکی باشی وەک تۆدا نەدەهات.»

من ئەوکاتە هیچ قسەیەکی ترم نەکرد، تەنیا باوەشەکەیم قبووڵ کرد، بۆ یەکەم جار بوو لە دوای باوەشی دایکمەوە، هەست بە ئارامی و نەرمییەکی لەو شێوەیە بکەم، باوەشی ئانیا شتێکی تایبەتی تێدا بوو، هەستێکی تایبەتی بە من بەخشی، دوور لە هەموو غەریزەیەک... تەواوی هەستەکانم بۆ ئانیا کرانەوە و هەر بەڕاستی لەوێوە بەتەواوەتی کەوتە دڵمەوە و خۆشمویست، هەر لەوێیش بەڵێنم پێی دا ئازادیی ڕابردووی بۆ بگێڕمەوە و تۆڵەی ئەو ناخۆشییانەی بۆ بکەمەوە کە بەسەریان هێناوە.

زۆر زیرەک بوو، بۆ ئەوەی لەو مەوقیفە عاتفییە دەرمبێنێ، وتی: «تۆڵەی میزبەخۆداکردنەکەیشم لێیان دەکەیەوە؟» ئیتر هەردوکمان بە چاوی پڕفرمێسکەوە لە ناخی دڵمانەوە پێکەنیین و لە یەکتری دوور کەوتینەوە، چونکە هیچمان نەماندەویست لەوە زیاتر لای یەک بین، نەوەک تاوانێک ئەنجام بدەین. ئیتر هەر خۆم تەلەفۆنم بۆ دایکم کرد و وتم:

«دایە گیان، ئەوە کەی دێنەوە؟» وتی: «وەڵڵا کوڕم ئێمە هەر لە پێش دەرگاین، بۆ هیچ کوێ نەڕۆیشتووین، چاوەڕێ بووین تەلەفۆن بکەن و بێینەوە ژوورێ بزانین چی ڕوویداوە، ئەهاااا ئەوە دێینەوە.» ئەو قسانەی کرد و تەلەفۆنەکەی داخست، دەنگی دەرگاکە هات، هاتنەوە ژوورەوە.

هەردووکیان چاوەکانیان هیوای ژیانێکی خۆشیان لێ دەباری، منیش بە دایکمم وت: «دایە گیان، ئیتر لەمەودوا بوکێکیش لە ماڵەکەدایە، هیوادارم خەسوویەکی باش بیت!» لە خۆشیان خێرا هەلهەلەیەکی لێدا و باوکیشم زۆر جوان دەستی کرد بە پێکەنین، ئانیایش دەستی بە دەمی خۆیەوە گرت و پێ دەچوو شەرم دایگرتبێت.

ئەو ڕۆژە ڕێک، شەشی مانگی دوو بوو، لە ماڵی ئێمە ڕۆژێکی زۆر تایبەت بوو، چونکە خەندەی دایک و باوکم خەندەیەکی زۆر ڕاستەقینە بوو، زۆر زۆر دڵم خۆش بوو بەو شێوەیە دایک و باوکم دەبینی، لە لایەکی تریشەوە هەستە نێرینەییەکانم بە هەمان شێوە دڵیان خۆش بوو کە ئانیا دەبێت بە هیی من، چونکە هەر بەڕاستی لە دوای ئەو قسانەوە بە چاوی کچێک سەیری ئانیام کرد، نەک وەک قوربانییەک. بۆیشم دەرکەوت ئانیا هەر بەڕاستی یەک پارچە گوڵە. چەند لە مێژە لەو ماڵەدایە، کەچی هەموو ئەو ماوەیە هەرگیز بە

چاوی کچێک سەیریم نەکردبوو، بۆیە جوانی و ناسکییەکەیم نەبینیبوو.

ئانیا، کچێکی وردیلە بوو، دەم و لووتێکی زۆر زۆر ڕێکی هەبوو، لەگەڵ دوو چاوی تیژی بێتاوان، بەڕاستی هەر ئەو کاتە کە سەیرم کرد، جەستەیەکی یەکجار سەرنج ڕاکێشیشی هەبوو، نەمدەزانی من چۆن ئەم هەموو ماوەیە ئەو هەموو جوانییەیم نەبینیوە، لەوانەیە هەر خودا خۆی یارمەتی دابم چاوم لە ڕاست جوانیی ئانیا کوێر بێت، بۆ ئەوەی نەکەومە هیچ هەڵەیەکەوە.

هەموو شتێک ئەو ڕۆژە جوان بوو، هەموو شتێک... خەندەکانی دایک و باوکم، شەرمەکەی ئانیا، بیرکردنەوەکانی خۆم و هەموو شتێک، لە ڕۆژێکی زۆر ئاسمانی دەچوو.

هەر ئەو شەوە لەسەر ئامادەکارییەکان دەستمان بە گفتوگۆ کرد. باوکم وتی: «دەبێ هەر سبەی مارە بکرێن، چونکە دەزانم مادەم شتێکی وا لە گۆڕێیە و لە یەک ماڵیشدان، هەستتان بۆ یەکتری دەجوڵێ.» کە باوک و دایکم قسەی وایان دەکرد، ئێمە هەردووکمان سوور دەبووینەوە، بەڵام پێیشمان خۆش بوو، ئیتر هەر بۆ ڕۆژی دوایی مەلایەکی هاوڕێی باوکم هات، ئێمەی لێکدی مارە کرد و بۆ ڕۆژی دواتر چووین بۆ مەحکەمە و هەموو شتێکمان تەواو کرد.

ئانیا لە ڕێگەی مەحکەمە دەستی گرتم و وتی: «توانا، من دەمەوێ بەو پارەیەی کۆم کردۆتەوە سەیارەیەک بۆ خۆمان بکڕم، جیا لە سەیارەکەی بابە، تۆیش بەو پارەیەی هەتە ژورەکەی خۆت بکە ژوورێک بۆ هەردووکمان و بە جوانترین شێوە بەیەکەوە دەیڕازێنینەوە، هەر بەڕاستی تۆ موعجیزەیەکی زۆر جوانی، لە ژیانی مندا ئاوا لەناکاو پەیدا بوویت.» منیش تەنیا زەردەخەنەیەکم بۆ کرد و وتم: «بەسەرچاو ژنەکەم!» و هەردووکمان دامانە قاقای پێکەنین....

لە ڕۆژی هاوسەرگیرییەکەمانەوە من و ئانیا بەتەواوی ژیانمان گۆڕا، هەر بەڕاستی من ئەو هەموو ماوەیەی ئەو کچە لەناو ماڵەکەماندا بوو، چۆن ئەو هەموو جوانییەیم نەبینیبوو؟ نازانم! زۆر سەرم لەو شتە سوڕ مابوو، تەنانەت هەندێک جار بیرم لەوە دەکردەوە بچم بە کەسێکی شارەزا بڵێم، چۆن و بۆچی شتێکی وا ڕوویداوە، بۆچی هەرگیز ئانیام وا نەبینیبوو کە کچێکە و لە ماڵەکەماندایە، تا حەزم بۆی بجووڵێت و بە چاوێکی تایبەتەوە سەیری بکەم...؟! زۆرم لا سەیر بوو!

بەڵام ئێستا کە بووە بە هاوسەری خۆم، هەر بەڕاستی پێم وایە ناتوانم وەسفی جوانییەکەی لە چیرۆکەکەمدا جێ بکەمەوە، پێشم سەیرە حاڵەتێکی وام بەسەردا هاتووە، هەرگیز ئەو هەستانەم بۆ هیچ کەسێک نەبووە کە بۆ ئەو کچە هەمن، بەڕاستی ساتێکی زۆر سەیرە لە ژیانمدا. ڕاستە دایک و باوک خۆشەویستن، هەستەکەم خۆشەویستی دوای

هاوسەرگیرییش وا بێت، زۆر بیر دەکەیتەوە، نازانیت ئەو کەسەت بۆ خۆشدەوێت، بەڵام دڵنیایت زۆرت خۆشدەوێت، وەک دایک وایە، هەرچەند لەگەڵتدا خراپیش بێت و هیچ چاکەیەکیشت بەرانبەر نەکات، لەوانەیە نەتوانی دەست لە ئەشقەکەت بۆی هەڵبگری، ئەڵبەت کاتێک ئەو هەستانە دروست دەبێت، بەڕاستی وەک من ئاشقی هاوسەرەکەی خۆت بیت.

ئانیا ڕێک دوای ئەوەی مەلا مارەی بڕی و بۆ یەکەم جار دەستەکانیم گرت، هەستێکی تایبەتی پێ بەخشیم، کاتێک دەستی دەگرم لەجیاتیی ئەوەی بیر لەوە بکەمەوە پێویستە پارە کۆ بکەمەوە و شتی جوانی بۆ بکڕم، هەست بە ئارامییەکی زۆر دەکەم، کاتێک لە باوەشی دەگرم، هەست دەکەم هەموو دونیا لە باوەشمدایە، ڕاستییەکەی نازانم ئەویش هەمان هەستی بۆ من هەیە یان نا، بەڵام زۆر دڵنیام ئەویش منی زۆر خۆشدەوێت. لە چاوەکانی و لەو کاتانەیدا بەتەنیا پێکەوەین هەست بە خۆشەویستییەکەی دەکەم. ئەو کاتانەی لە باوەشی دەگرم و پێم دەڵێ «خۆشمدەوێیت»، هەست بە خۆشەویستییەکەی دەکەم... هەر بەڕاستی هەستێکی سەیر و شاعیرانەیە، من وام دەزانی ئەو هەستانەی ئێستا هەمن، تەنیا لە چیرۆک و فیلمەکاندا هەن، بەڵام نا، هەر بەڕاستی ئەو هەستە ناوازە ناسکانە لە واقعیشدا هەن، بەڵام

ئەوەیە دەبێ بزانی لەگەڵ کێ ئەو هەستانە ئاڵوگۆڕ دەکەیت و چۆن دەیگەیێنیت بە خۆشەویستەکەت، شتێکی زۆر ناوازەیە هەستێکی وات بۆ کەسێک هەبێت کە کەمتر لە ساڵێکە پێی ئاشنایت و دەیناسیت.

ئەو هەستەیە پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێت تا نهێنیترین نهێنییەکانی ژیانی خۆی لا بدرکێنێت، ئەو هەستەیە وای لە ئانیا کرد لە بەرانبەر پارەیەکی زۆردا، تەنانەت دوای ئەوەی هەڕەشەی کوشتنیشیان لێ کرد، ئامادە نەبێت جەستەی خۆی ببەخشێت بە هیچ کەسێک، بەڵام لەپێناو ئەو هەستەدا، هەر یەکەم شەوی پێکەوەبوونمان ئامادەربوو ئەو جەستە بەنرخەی ببەخشێت بە من و منیش بە هەمان شێوە خۆم بیبەخشم بەو.

من پێم وایە، هەرچەندە باسی هەستی خۆشەویستیی نێوان دوو کەس بکەم، بێسوودە و هەرگیز کەسێک کە خۆی ئاشق نەبووبێت، ناتوانێت تێبگات چۆن هەستێکە، کەسی وا هەرگیز لە حاڵ و دڵی کەسێکی ئاشق تێناگات. بەڵام کاتێک خۆی بەو ئەزموونەدا تێدەپەڕێت، دەزانێت چ هەستێکی ناوازەیە وا لەپێناویدا دەتوانیت بەنرخترین و تایبەتترین شتت کە جەستەتە، ببەخشیت بەو کەسەی خۆشتدەوێت، ئامادەیت هەرچی نهێنییەکانی ناو ڕۆحتە دەریبێنیت و پێی بڵێیت، ئامادەیت هەموو ئەو هەستە هەرزەکارانەییانەی ڕۆژێک لە

ڕۆژان خەوت پێوە بینیون و ویســـتووتە لەگەڵ کەســێکدا جێبەجێیان بکەیت بەڵام شەرمت کردووە، لەگەڵ ئەودا بەشیان بکەیت و لەتەک ئەودا ئەنجامی بدەیت. ئاااههـــــ بەڕاســتی هەستێکی زۆر جوانە......

من چونکە هیچ ســۆشــیاڵ میدیایەکم بەکارنەدەهێنا و ئانیایش لەبەر ئەو کێشــانە هەموویانی ســڕیبۆوە، کەس هەر نەیزانیبوو هاوســەرگیریم کردووە، تا ئەوەی دوای ســێ ڕۆژ نەچوونەوەم بۆ دەوام، چوومەوە و شــیرینیم بەســەر گرووپەکەمدا دابەش کرد، کە پرسییان شیرینییەکە هی چییە؟ وتم، دوای ئەوەی خواردتان بە یەک جار بە هەمووتانی دەڵێم، نەک بۆ هەموانی دووبـارە بکەمەوە! ئیتر کە هەموویـان شــیرینییان هەڵگرت، چوومە ســەر ســەکۆی وانەوتنەوەکە و وتم: «من ژیانی هاوســەریم پێکهێناوە و هیوادارم بەختەوەر بم و نەخشــە بێ لە ئێوەیش.» ئیتر هەریەکە و بە جۆرێک پێدەکەنی و پیرۆزبایی لێم دەکرد، هەندێکیش گلەیی ئەوەیان دەکرد پێم نەوتوون بۆ ئاهەنگەکە، منیش بەردەوام خەریکی ئەوە بووم تێیانبگەیێنم هیچ ئاهەنگێک لە گۆڕێدا نەبووە، بۆیە بە کەســیشــم نەوتووە... هەرچۆنێک بێت ئەو ڕۆژانە زۆر بەخۆشــی ڕۆیشــتن و بەشــێک بوون لە خۆشــترین ڕۆژەکانی ژیانی من و ئانیایش.

شـــەوێک من و ئانیا و دایک و باوکم دانیشـــتبووین و خەریکی میوەخواردن و باســی ســەیارەکڕین بووین، چونکە ئانیا دەیویست پارەکەی خۆیشی لەسەر پارەکەی من دابنێ و بەیەکەوە سەیارەیەک بکڕین، ئەو شەوە منیش لە ماڵ بووم، چونکە پێنجشـەممان و جومعان نەدەچووم بۆ دەرمانخانە، لە دوای هاوسەرگیرییشەوە تا سەعات حەوتی شەو دەمامەوە، چونکە نەمدەویست زۆر لە ئانیا دوور بم و بەردەوام خەریکی ئیشـکردن بم و ئاگام لێی نەمێنێت، ئەو شـەوەیش هەر وەک هەموو شـەوەکانی تر ئاسایی بوو، بەیەکەوە قسـەمان دەکرد و پێدەکەنیین و دەمانویست لەسەر سەیارەیەک ڕێک بکەوین کە بەنزینی زۆر نەوێت، بۆ ئەوەی بتوانم بە پارەی مانگانەکەم مەســـرەفەکەی بکەم. بەڵام بەپێچەوانەی هەموو شـــەوە ئارامەکـانی ترەوە، لەنـاکـاو یەکێـک بەتونـدی لە دەرگەی حەوشـــەمانی دا، ســـەرەتا هەر وامانزانی میوانێکە و بەبۆنەی هـاوســـەرگیرییەکەوە هـاتووە، بەڵام لەدوای تەقەی یەکەم ئەمجـارە زۆر بەخێرایـی و بە تـونـدتـر لە دەرگـاکەی دا، بەبەردەوامی لە دەرگای دەدا، وەک ئەوەی شـــەق لە دەرگاکە بدا، باوکیشــم وتی: «ئێوە لێرە بن، من دەچم دەیکەمەوە.» کە دەرگاکەی کردەوە، کۆمەڵێک پیاو بوون، ماسکیان بەستبوو، پاڵیان بە باوکمەوە نا و خستیانە سـەر ئەرزەکە، پێش ئەوەی هەستێتەوە دانەیەکیان دەمانچەی لەسەر سەری دانا و وتی:

«هەر بجولێیت دەتکوژم!» هەموو ئەو شتانە زۆر زۆر بەخێرایی ڕوویاندا و هەموومان تووشی شۆک بووبووین، دایکم و ئانیا دەستیان بە قیژە قیژ کرد و من ویستم بچم باوکم ڕزگار بکەم، بەڵام پیاوێکیان تەقەی کرد و گوللەیەک بەر قاچم کەوت، من لەسەر ئەرزەکە بووم کە بینیم یەکێک لە پیاوەکان چووە ژوورەوە و لەدوای ئەویشەوە ژنێک دەرکەوت، هاواری کرد: «ئەو کچە گەنجە هەوە، بیهێنن!» کە باوکم ئەمەی بینی، نەیتوانی خۆی بگری، هەستایەوە و ویستی چەکەکە لە پیاوەکە وەربگرێت، بەڵام پیاوەکە زۆر لەو بەهێزتر و گەورەتر بوو، هەر بە چەکەکەی دەستی لەسەری باوکمی دا و باوکم لە هۆش چووەوە و خوێنی بە سەریدا هاتە خوارەوە. ئەوەی ئەو کاتە من گوێم لێ بوو، تەنیا قیژەی دایکم و ئانیا بوو، کۆتا شت کە بیرمە ئەو دیمە نەبوو کە پیاوێکی ناپیاو بە قژ ئانیاکەمی فڕێدایە ناو یەکێک لە ئۆتۆمبێلەکانەوە و یەکێک لە پیاوەکانی تر دایکمی بە دیوارەکەدا دا، ئەویش بووڕایەوە...

من کاتێک بە هۆش خۆم هاتمەوە، لە نەخۆشخانە بووین و باوکم و دایکم لەسەر سەرم وەستابوون، ویستم بجووڵێم و هەستمەوە تا بچم ئانیا ڕزگار بکەم، بەڵام کە بە هۆش خۆم هاتمەوە، بینیم ناتوانم بجووڵێم و دوو بتڵی خوێن بەسەر سەرمەوەن، دایک و باوکم هەردووکیان ڕەنگیان زەرد

هەڵگەڕابوو و بەدیارمەوە بوون. ئەو کاتە لە قاچەکانمدا هەستم بە ئازارێکی بێئەندازە دەکرد، چاوم بەجوانی دەوروبەرمی نەدەبینی و خۆیشم نەمدەزانی شتەکان چۆن بێرە گەیشتوون، بەڵام دوای ئەوەی بەتەواوەتی بە هۆش خۆم هاتمەوە، دایک و باوکیشم چووبوونەوە سەر قەرەوێڵەکان و ئاویان بۆ هەڵواسرابوو، بۆم دەرکەوت ئەوانیش هەردووکیان لە من نەخۆشترن، تەنیا لەتاو مندا هەستابوونە سەرپێ تا بە هۆش خۆم بێمەوە و لە تەندروستیم دڵنیا ببنەوە. ئەگینا ئەوانیش یەک لە یەک خراپتر بوون!

وتم: «دایکە، باوکە...» هەر ئەو دوو وشەیەم وت و فرمێسک بە شێوەیەکی لەناکاو لە چاوانم هاتە خوارێ و قسەکەم بۆ تەواو نەکرا، دەمویست بڵێم: دایە، بابە، چی بووە؟ کوا ئانیا؟ ئەی هاوار چی بووە؟! پێش ئەوەی من ئەو قسانە بکەم، من هەر دەگریام و قسەم بۆ نەدەکرا، باوکم بە دەنگێکی پڕ لە سۆز و متمانەبەخۆبوونەوە وتی: «کوڕم، هێواش بە، ئێرە نەخۆشخانەیە، خەڵکی تریشی لێیە، ئێمەیش وەک تۆ نازانین چی بووە، تەنها ئەوەیە کاک ڕزگاری دراوسێمان دوای ئەوەی لە ماڵی خۆمانەوە گوێی لە دەنگی تەقە بووە، هاتووە و ئێمەی حەوشەدا بە بێهۆشی بینیوە، هێناونی بۆ نەخۆشخانە، ئیتر ئێمەیش هەر ئەوەندە دەزانین!»

من ئەو کاتە زۆر توورە بووبووم و چاوم هیچ شـــتێکی نەدەدیت، بە گریانەوە هاوارم دەکرد: «ئەی کوا پۆلیس؟ ئەی کوا؟ بۆ کەس بۆ گەڕاندنەوەی ئانیاکەم هیچ ناکات، ئاخر ئەو زاڵمانە ئازاری دەدەن... ئەی هاوارررر!» کە من ئەو قســـانەم دەکرد، دەمبینی باوکیشـــم ســـەری نەوی دەکرد و دەگریا، دایکیشم دووبارە هاواری دەکرد و دەیقیژاند. بۆ ساتێک من لە گریان وەســتام و بینیم قاوشــەکە هەمووی ســەیری ئێمەیان دەکرد و هەنـدێـک لە نەخۆشـــەکـانی تریش لەگەڵ ئێمەدا دەگریان، من نەمدەزانی لەو کاتەدا چ بکەم باشــە و چ شـتێک خراپە، تەنیا دەمویســـت ئانیا ببینمەوە، یەک دنیا پرســـیاری وەک ئەوەیشـــی «چۆن بەوەیان زانیبوو ئانیا لە ماڵی ئێمەیە؟ مـاڵی ئێمەیـان دۆزیبووەوە؟ چەنێکە لە کوێ بوون؟» نـاو سەرمدا دەهاتن و دەچوون. بۆ هیچیشیان وەڵامێکی گونجاوم پێ نەبوو، بۆیە خەریک بوو ســـەرم دەتەقی، بەردەوامیش ســـەرم دەســـووڕا، بەوەدا دەمزانی خوێنێکی زۆرم لێ ڕۆیشـتووە، لە لایەکی تری مێشـکیشـمەوە هەندێک بیرۆکەی ســـەیری وەک ئەوەی «ئایا دەبێ قاچم ئێش بکا؟» ســـەریان هەڵدەدا، هەندێک بیرۆکەی تریشـــم لەناکاو بۆ دەهاتن، ئەو شەوانەیان بیر دەهێنامەوە وا من و ئانیا چووبووین بۆ هۆتێلە پێنج ئەســـتێرەییەکـان، بۆ ئەوەی بەتەنیـا کـاتێکی خۆش بەســـەربەرین... نەمـدەزانی ئەو هەموو بیرۆکەیە لە کوێوە

دێن، کە هیچیان پەیوەندییان بەوی تریانەوە نییە! بۆ نموونە ڕیک لەو کاتەیدا بیرم لە باوەشی ئانیا دەکردەوە، لەناکاو بیرم بۆ ئەوە دەچوو ئەو نەخۆشـــانەیش وا من و برادەرەکـانی کۆلێژم دیینە ســەریان و پرســیاریان لێ دەکەین، هەمان ئەو هەستەی ئێستای منیان هەیە! دواتر بۆنی ئانیا دەهاتەوە فیکر و فرمێسکم بەخوڕتر لە چاوان دەهاتە خوارێ.

ئەو ســاتانەی ناو ئەو قاوشـــە، بە هیچ جۆرێک لە یاد ناچنەوە، هەرگیز ناتوانم ئەو ساتانە لە بیر خۆم ببەمەوە و تا ئێســـتایش کە دەخەوم، بە هەمان یادی ئەو ســـاتانەوە خەو دەچێتە چـاوم. دوای مـاوەیەک لە گریـان و ئەو بیرکردنەوە ئـاڵۆزانە، پزیشـــکێـک و ئەفســـەرێکی پۆلیس هـاتنە لام، پزیشـکەکە بە ئەفســـەرەکەی وت: «فەرموو بەڕێز، ئێســتا بە هۆش خۆی هاتۆتەوە و دەتوانن پرسیاری لێ بکەن.»

ئەفســـەرەکە کەسێکی زۆر بەڕێز بوو، ســـەرەتا وتی: «من نەقیب ڕەوەندم و ســـەبارەت بە ڕووداوەکەی هەفتەی ڕابردوو هەندێک پرســـیارت لێ دەکەم!» کە ئەوەی وت، زیاتر تووشـــی شۆک بووم، چونکە ئەو کاتە زانیم هەفتەیەکە لە نەخۆشخانەم و تازە بە هۆش خۆم هاتوومەتەوە، ئەوکاتەی ئەو قســـەیەی کرد، هێندەی تر دڵم بۆ ئانیا پڕ بوو و پرســـیاری ئەوەی ئاخۆ دەبێ چی بەسەر هاتبێ؟ ناو مێشکمدا دەهات و دەچوو.

ئەفسەرەکە پرسیی: «لەگەڵ هیچ کەسێکدا کێشەیەکتان هەیە؟» وتم، نەخێر، هیچ کێشەیەکمان نییە، تەنیا ئەوە هەیە ئانیا لە شوێنێکی واوە هاتووە و منیش یارمەتیم داوە و ڕزگارم کردووە. ئیتر لە قاوشەکەدا هەموو بەسەرهاتی ئانیام بۆ گێڕایەوە، هەموو نەخۆشەکانی ئەوێ گوێیان لە قسەکانم بوو، ڕاستییەکەی ئەو کاتە من بیرم لەوە نەدەکردەوە، بەڵام ئێستا کە ئەم قسانە دەنووسمەوە بیر دەکەمەوە، باشە چۆن دەبێ کەس حساب بۆ شتە تایبەتییەکانم نەکات و بێت و لەناو قاوشێکی هەشت نەفەریدا ئەو پرسیارە تایبەتییانەم لێ بکات؟! من بەهۆی وەڵامەکانمەوە، زانیاریم تەنیا بە ئەفسەرەکە نەدەدا، بەڵکە بۆ هەموو قاوشەکەم باس دەکرد، هەر بۆیەشە کە من قسەم دەکرد، هەریەکە و بە جۆرێک ڕەفتاری دەکرد و کاردانەوەی دەبوو، هەندێک ژن ورتە ورتێکیان لێوە دەهات، هیچ بە دڵم نەبوو و لەوە نەدەچوو زمانی خێر بە بابەتەکەدا بێنن، بەڵام چییش بکەم، دەمویست هەرچی زووە ئەو خەوە ناخۆشە کۆتایی پێ بێت و ئانیا بگەڕێتەوە لام. کە ئەفسەرەکە پرسیارەکانی تەواو کرد، وتی: «زۆر باشە، ئێمە پەڕاوی لێکۆڵینەوەمان کردۆتەوە بۆ دۆسییەکەی ئێوە و بە زووترین کات وەڵامتان دەدەینەوە، ئایا ئێوە داواتان لەسەر هیچ کەسێک هەیە؟ وتم: «بەڵێ بەڕێزم، داوام لەسەر کچێک هەیە بە ناوی شێنێ، ناوی باوکی نازانم، داوام لەسەر خاوەنی

سـالۆنەکەیشـی هەیە کە لە شـەقامە دووسـایدەکەی بینا تازەکانە، ئەوان بەرپرسـی یەکەمی ئەنجامدانی ئەو کارەن.»

پێشـتر ناوونیشـانی سـالۆنەکەم لە ئانیا پرسـیبوو و لێیم وەرگرتبوو، چونکە هەمیشـە شـەوان لەناو باوەشـی یەکتری ژیانی خۆمان بۆ یەک دەگێڕایەوە، بۆیە دەمزانی ئانیا پێشـتر ئیشی لە کوێ کردووە و چۆن گەیشتووە بە من.

ڕاسـتە ئەو ماوەیەی لەو قاوشـە بووم، تەنیا هەشـت - نۆ ڕۆژێک بوو، بەڵام ڕێک وەک ئەوە وا بوو هەموو ژیانم لەوێ بووبم، کاتەکانی ئەم شوێنە بە جۆرێک سەیر بوون، دەقەیەک بووبوو بە یەک ڕۆژی تەواو، جا وا تێنەگەی ئەو شـتە تەنیا بۆ بەراورد کردن دەڵێم، من هەر بەڕاسـت پێم وا بوو یەک دەقەی ئەو شـوێنە یەک ڕۆژ یان یەک هەفتەیە. نەمدەزانی چۆن هاوار بکەم، چۆن بیر بکەمەوە، چۆن ئانیاکەم لە دەستی ئەوانە ڕزگار بکەم! نەمدەزانی ئایا ئێسـتا ئەو چۆنە؟ برسـییە؟ تینووە؟ دەترسـێ؟ ئاخر ئەو هەمیشـە دەیگوت لە باوەشـی تواناادا هەسـت بە هەموو تواناکانی خۆی دەکات و هەسـت دەکـات بەهێزە، هەسـت دەکـات یەکێـک هەیە لە پشـتی ڕادەوەسـتێت، بەڵام ئێسـتا کە تواناکەی بە قاچێکی زامدارەوە لە قـاوشـێکی بێنـازدا ڕاکشـاوە و تەنیـا بۆ میزکردن هەڵدەسـتێتەوە... دەبێ چەند بترسـێت! ئاای خوایە، لەوانەیە زۆربەی خەڵـک بڵێن ئـازاری لەدایکبوون گەورەترین ئـازارە

مرۆڤێک تووشـــی ببێت، بەڵام نەخێر، ئەو کاتەی پیاوێک هەســـت دەکات کە بێدەســـەڵاتە، ئەوە گەورەترین ئازارێکە مرۆڤێک لە هەموو ژیانیدا هەستی پێ بکات و دەرکی بکات..

هەرچۆنێک بوو ئەو ڕۆژانەی نەخۆشـــخانە تەواو بوون، هیچ وەڵامێکمـان لە پۆلیس وەرنەگرتبووەوە، کەســـیش ســـەردانی نەکردبووین، چونکە خزمەکانمان لێمانەوە دوور بوون، باوەڕ ناکەم زانیبێتیان شتێکی وا ڕوویداوە، تاکە کەس ڕۆژانە دەهاتە لامان، کاک ڕزگاری دراوســـێمان بوو، کە بەردەوام لەگەڵ باوکم لە ڕێگەی مزگەوت بەیەکەوە بوون، بۆیە دەهات و لە ئەحواڵی دەپرسیین، پرسیاری ئەوەی دەکرد، هیچ شـــتێکمان پێویســـتە نییە؟ ئەو کات ئەو کاک ڕزگارەی ئەهلی مزگەوت، تاکە کەس بوو بتوانێت خۆشـــییەکی زۆر کەمیش بێت، بە ئێمە ببەخشـــێت، ئێمە لە خێزانێکی زۆر بەختەوەرەوە گۆڕاین بۆ ســـێ کەســـی لەســـەر قەرەوێڵەی نەخۆشخانە کەوتوو...

ئەو ڕۆژەی لە نەخۆشـــخانە دەرچووین، دەمویســـت بە زووترین کات لەســـەر پێیەکانی خۆم بڕۆم، بەڵام پزیشکەکان دەیانگوت بە لایەنی کەمەوە دەبێت بۆ ماوەی دوو مانگ گەچەکەت پێوە بێت، چونکە گوللەکە ڕاســـتەوخۆ داویەتی لە ئێسکی قاچت و بڕیویەتی، بۆیە دەبێ زۆر ئاگات لە خۆت بێت و ئیسراحەتی لەسەر بکەیت.

ئاخر من کوا ئیسراحەتم ماوە، من ئانیا تاقانەکەم لێ دوورە، نازانم ماوە یا مردووە، نازانم سەر و سۆراغی چییە و لە کوێیە، چۆن دەتوانم ئیسراحەت بکەم؟! کە دەڕۆشتینە دەرەوە لە نەخۆشخانە، ڕاستەوخۆ وتم: «باوکە گیان، بە خوا من بێ ئەوەی خەمێکی ئانیا بخۆم، ناتوانم بێمەوە ئەو ماڵە، دەبێ ڕاستەوخۆ بچین بۆ بنکەی پۆلیس.» ئەوانیش بێ ئەوەی مناقەشەم لەگەڵ بکەن، تەنیا سەرێکیان لەقاند و وتیان: باشە. ئیتر هەر لەوێوە بەیەکەوە چووین بۆ بنکەی پۆلیس.

لەوێ دۆسییەکەمانیان کردەوە و وتیان، ئەو کەسەی شکایەتتان لێ کردووە لەو شوێنە نەماوە کە ئاماژەتان پێی داوە... پێش ئەوەی ئەفسەرەکە قسەکانی تەواو بکات، ئاگر لە چاوانم بڵێسەیان دا و بیرکردنەوەکانم بەتەواوەتی وەستان، هەستم کرد شتێکی وەک پشکۆی ئاگر لەناکاو لەناو سەرم دانرا و گەرم بوو، هەستم دەکرد مێشکم ئەوەندە گەرم بووە، خەریکە لەبن پشکۆ ئاگرەکەدا دەتوێتەوە، بۆیە نەمهێشت ئەفسەرەکە قسەکانی تەواو بکات، بە هەموو توانستی خۆم بەسەریدا هاوارم کرد و جنێوم پێی دا، هاوارم دەکرد: «ئەی ئێوە بۆچی لێرەن؟ ئەی بۆچی لێرەن؟ بۆ ناتوانن ئانیاکەی من بدۆزنەوە؟ ئاخر ئێوە ئیشتان چییە؟ چۆن دەتوانن بڵێن نەماندۆزییەوە چۆوۆن؟!» ئەوەندەم زانی بەبێ ویستی خۆم

قورگم پڕ بوو لە گریان، فرمێسکەکانم یەک لەدوای یەک هاتنە خوارەوە و بەردەوام ئەو قسـانەم دووبارە دەکردەوە، باوک و دایکم لێم هاتنە پێشـــەوە تا ئارامم بکەنەوە، بەڵام من جەرگم سـوتابوو، بە هیچ شـێوەیەک ئارامم نەدەگرت، بەردەوام هـاوارم دەکرد، تـا بـاوکم زللەیەکی زۆر تونـدی لێ نەدام، بێدەنگ نەبووم! ئەو زللەیەیەی ئەو کاتە باوکم لێی دام، ڕێک نـاو زینـدانی بیر هێنـامەوە، ئەو ڕۆژەی بیر هێنـامەوە کە بۆ تـاوانێـک گیرابووم هەرگیز ئەنجـامم نەدابوو. لە دوای ئەو زللەیەوە یەک قسـەیش چی بوو، نەمکرد، ئەوەی هەبوو تەنیا هەنسـکی گریانەکانم بوو، لەگەڵ ئەو فرمێسـکانەی لەبەر زۆرییـان ڕێگەیـان لێ ون بووبوو و لە لووتمەوە دەهـاتنە دەرێ. پۆلیسـەکە وتی: «من لێت تێدەگەم گەنجی جوان، بەڵام بێڵە با قسـەکانم تەواو بکەم، ئێمە لەدوای گەڕانێکی زۆر، هەر ئەو شـەوە تاوانبار (ڕا، عەین، قاف)مان دەسـتگیر کردووە و خـاتوو ئـانیـای تۆیشـمـان هێنـاوەتەوە و بۆ لێکۆڵینەوە لە دۆسـییەکەی، لە مەرکەز دامانناوە، ئەگەر تۆزێک سـەبرت هەبێت سـبەی دەیبینیت، بەڵام لەبەر ئەو بێڕێزییـانەی بە حەرەمی بنکەکەمـانت کرد، بە هیچ شـێوەیەک ناهێڵم ئەمڕۆ چاوت پێی بکەوێت!»

ئەو کاتە، باوک و دایکم زەردەخەنەیەک هاتە سـەر لێوانیان و منیش دەمم کرایەوە، یەک وشـە چی بوو نەمدەتوانی بیڵێم،

نەمدەزانی دەبێ چی بکەم، ئەوەندە دەزانم ئێستا کە دایکم بۆم دەگێڕێتەوە، ئەوکاتە ڕێک وەک ڕەنگی تەماتەیەکی خۆماڵی سوور هەڵگەڕاوم و لێوم لەرزیون، نەمدەزانی چ شتێک بڵێم، هەموو گیانم بووبوو بە ئارەقەی شەرمەزاری لەبەرانبەر ئەفسەرەکەدا، دەمویست ئەوکاتە لەناو ئارەقەی خۆمدا بخنکێم، هەر لەوێدا بمرم، بەڵام ئەوەندە شەرمەزاری ئەو ئەفسەرەی پۆلیس نەبم، بۆیە بەبێ ویستی خۆم کەوتمە سەر چۆک و ویستم لەبەری بپاڕێمەوە بهێڵێ ئانیا ببینم، بەڵام هەر کە کەوتمە سەرچۆک، ئازارێک لە قاچما دروست بوو، لە هەموو ژیانمدا ئازاری جەستەیی لەو شێوەیەم نەچەشتووە، یەکسەر لە تاو ئازارەکەدا بە دەمدا کەوتم و بەربوومەوە، ئێستایش کە ئەوکاتەم بیر دەکەوێتەوە، تاکە پێناسە دەتوانم بۆی بکەم بریتییە لە زەلیلی، چونکە ئەوکات لە هەموو کاتەکانی ژیانم زیاتر لەبەردەم کەسێکدا هەستم بە کەمیی خۆم دەکرد، هەم لەبەر ئەوەی ئەو دەسەڵاتی لە من زیاتر بوو، هەم لەبەر ئەوەی ئەو لەسەر حەق بوو و من قسەم پێی وتبوو و زۆر شەرمەزاری بووبووم.

لەدوای ئەوەی ئەفسەرەکە ئێمەی وا بە داماوی بینی، - منێکی قاچ شکاو و دایک و باوکێک کە ئەوەندەی خەمیان لە گریانە بەردەوامەکانی من و ڕەفتارە سەرەڕۆیانەکانم خواردبوو، ڕەنگیان زەرد زەرد بووبوو- وتی: «هەستەوە،

هەستەوە، بەسە، پیاو نابێت ئاوا خۆی بێدەسەڵات بکات، ئێمە ژنی تۆمان بۆچییە؟ خۆ زیندانیمان نەکردووە! ئەوا لەودیوە شکاتی خۆی لەسەر ئەو کەسانەی تاوانەکەیان بەرانبەر ئەنجام داوە دەنووسێت و دێتە دەرەوە و لەگەڵت دێتەوە ماڵێ، ئەوجا چی لێ دەکەی لێی بکە!»

ئەو ساتە دڵم زۆر زۆر خۆش بوو، نەمدەزانی چی بڵێم، مێشکم وەستابوو، نەمدەزانی بۆ ئانیا یەک هەفتەیە لە بنکەی پۆلیسە و نەهاتووە بۆ نەخۆشخانە، بەڵام بەلایشمەوە گرنگ نەبوو، گرنگ ئەوە بوو دەمزانی ماوە و وا زۆر لێم نزیکە، ئەو کاتە هیچ بیرم لەو قسە بێشەرمانەی ئەفسەرەکە نەکردەوە و ویستم هەستمەوە، باوک و دایکم یارمەتییان دام و هەستامەوە، بێ ئەوەی هیچ قسەیەک بکەم، چوومەوە دەرەوە و لەبەر دەرگاکە چاوەڕێی ئانیامان دەکرد، ڕێک دوای حەوت دەقە ئانیا دەرکەوتەوە، چاوەکانم لەوانەیە ئەوەندەی لەو ماوەیەدا گریابوون، ئەوکاتە وشک بووبن، چونکە لەو ساتە خۆشەدا هیچ فرمێسکێکیان لێ نەهاتە خوارەوە، بەڵام دەمزانی بێ فرمێسک دەگریم!

هاتو باوەشێکی ئەوەندە پڕی پێدا کردم، خۆم هەرگیز باووەڕم نەدەکرد باوەشێک بتوانێ ئەوەندە مرۆڤێک بگۆڕێت، بتوانێ بارودۆخی ڕێک پێچەوانە بکاتەوە، ئەو ساتە دەکرێ بڵێم خۆشترین ساتی ژیانم بوو، تەنانەت خۆشتر لە یەکەم

باوەشـــی یەکەم شـــەوی هاوســـەرگیریشـــمان، چونکە هەر بەڕاســـتی من لەو کاتەوەی بە هۆش خۆم هاتبوومەوە تاکە شتێک بیرم لێی دەکردەوە ئانیا بوو، ئایا ئەو لە ژیان ماوە یان نـا، ئێســـتـاش کە لە بـاوەشـــمە، بەڕاســـتی هەســـتێکی پێناسەنەکراوە...

ئەو کاتە، دایک و باوکم لێکیان جیاکردینەوە، وتیان: «بەسە ڕۆڵە، بەســـە، تەواو، هەردووکتان سـەلامەتن الحمد لله، لێک بنەوە، زانیمان یەکتان خۆشـــدەوێت!» لەوانەیە باوەڕ نەکەن، بەڵام باوکم دەیگوت چارەکێکی تەواو بەبێ هیچ قســـەیەک لە باوەشـــی یەکدا بوونە، لەوانەیە کەســـێک ئەم قســـانەی من ببیســـتێت و بڵێ جا چارەکێک چییە؟ ئەو کـاتە دەزانیت چارەکێک چییە، خۆت تاقی بکەیتەوە، لە ناوەڕاســـتی شـــاردا یەک چارەک، بێ قســـە باوەش بە کەســـێکدا بکەیت و لێی نەبیتەوە، ئەوکات دەزانی چارەکێک باوەش چەندە زۆرە.

لەناو سەیارەدا بووین و ئانیا بۆ یەکەم جار لەدوای باوەش و هەموو شتێکەوە قسەی کرد، وتی: «توانا، دایە، بابە، توخوا بـمـبـوورن، مـن هـۆکـاری هـەمـوو ئەو نـاخـۆشـــیـانـەی خێزانەکەتانم، زۆر داوای لێبوردن دەکەم...»

هەر زوو ڕۆژانی ئازار و گریانمان لە بیر چووەوە، چونکە هەر بەڕاستی ئایا توانستێکی سەرنجڕاکێشی لە دڵخۆشکردنی دڵی دایک و باوکمدا هەبوو، منیش دەمویست بە وردبوونەوە لە زەردەخەنەی سەر لێوی دایک و باوکم بیرۆکەی ئەو باندە لە مێشکم دەربێنم، چونکە هەر ئەو ڕۆژەی خاوەنی سالۆنەکە دادگایی کرا، هەستم کرد ئیتر باندەکە لەبەر ئەم ڕووداوە دەترسن و چیتر شتێکی وا ئەنجام نادەنەوە، لە هەمان کاتیشدا بیرم لەوە دەکردەوە، ئەمجارە ئەگەر شتێکی وا بکەن ئەوا بە دڵنیاییەوە یەکێکمان دەبینە قوربانیی دەستی ئەو کەسە خراپانە... ئاخر ئێمە خێزانێکی زۆر بەختەوەر و بێزیان بووین، هەمیشە باوکم ئامۆژگاریی دەکردم دڵم فراوان بێت و هەوڵ بدەم لە مرۆڤەکان خۆش ببم، چونکە باوکم لە قووڵایی دڵییەوە باوەڕی وا بوو هەندێک لە مرۆڤەکان تاقیکردنەوەکەیان لەم دونیایەدا ئەوەیە، ئایا دەتوانن لە کەسانی زۆر خراپی چواردەوریان خۆش ببن یان نا؟

باوكم پێی وا بوو ئەو مرۆڤانەی دەتوانن شـــتەكان لە بیر خۆیـان ببەنەوە و لە خراپەی خەڵكـانی تر خۆش ببن، دیارییەكی خوداییان پێ بەخشـــراوە، بەهۆی ئەو دیارییەوە دەچنە بەهەشـــتەوە. بۆیە هەمیشـــە زۆر بەئاســانی لە خەڵك خۆش دەبوو، سـەرم زۆر لەو ساردییەی باوكم دەسوڕما كە هەمیشـــە دەموچاوێكی تایبەت و یەكجار نوورانیی هەبوو، بەردەوام زەردەخەنەیەكی زۆر نەرمیشی لە ڕوخساردا دەبینرا، تەنیا زەردەخەنەیەكی ئاسـایی نەبوو، بەڵكو شتێكی بەردەوام و هەمیشـــەیی بوو. لەوە دەچوو هەر لە ئەزەلەوە باوكم وەك پیاوێكی مزگەوتی دەمبەخەندە هاتبێتە دونیاوە، ڕێك باوكم لەو پیاوانە بوو وا كاتێك لە شـــوێنێك گەنجێكی وەك من دەیبینی، ئایینی لەلا جوان و خۆشەویست دەبوو و دەیویست ژیانی وەك ئەو بێت. هەرچۆنێك بێت، من نەمدەتوانی یەكجار وەك بـاوكم دڵنیـا و ئـاســـوودە بم، بۆیە ڕۆژێـك بە دزیی ئەوانەوە چوومە بنكەی پۆلیسەكە و ئەو ئەفسەرەم دۆزییەوە كە لە نەخۆشـــخانە پرســـیارەكانی لێ كردم، پێم وت: «تكایە دەمەوێ هەندێك قسـەت لەگەڵ بكەم.» ئەویش وەك پیشـەی هەمیشـەیی خۆی زۆر بە ڕێزەوە مامەڵەی لەگەڵ دەكردم، من لە لایەك شـــەرمەزاری ڕێزەكەی بووم، لەلایەكی تریش شـــەرمەزاری بێڕێزییەكەی ئەو ڕۆژە بووم وا ئـانیـایـان بۆ گەڕاندینەوە، بەڵام ئەو ڕۆژە هەرچۆنێك بێت پێم نا بە دڵی

خۆمدا و چوومە ناو بنکەکەوە بۆ قسەکردن لەگەڵ ئەم ئەفسەرەدا.

وتم: «جەنابی ئەفسەر، ئێمە خێزانێکی بێکەس و فەقیرین، باوکم مامۆستایەکی ئاساییە و منیش وا دەبینی هەم تەلەبەم و هەمیش کار دەکەم، خێزانەکەیشم لەبەر ئەو ڕووداوانە وازی لە کارکردن هێناوە، ئێستا دەمەوێ ئێوە دڵنیاییمان پێ بدەن جارێکی تر ئەو باندە هێرش ناکەنەوە سەرمان، ئاخر تەنیا یەک کەسیان گیراوە، کە خاوەنی ساڵۆنەکەیە، ئەی ئەو پیاوانەی گولەیەکیان لە قاچی من دا لە کوێن؟ ئەی ئەوان بۆ کوێ براون؟»

وام هەست دەکرد ئەفسەرەکە کاتێک گوێی لە قسەکانم دەگرت، بەپێچەوانەی ئەو کەسە سەربازییانەوە وا چەن جارێک بینیومن لەناو بازاڕدا لە عەرەبانەچی و دەستگێڕیان داوە، بەپێچەوانەی ئەوانەوە، زۆر میهرەبان دیار بوو، هەموو ئەو ماسوولکانەی دەموچاوی کە لە کۆلێژ خوێندبوومن لەگەڵ قسەکانمدا خاو دەبوونەوە و هەر بە دەموچاویدا دەمزانی بە جوانی گوێی بۆ گرتووم و خەمی بابەتەکەیەتی.

لە وەڵامی قسە و چیرۆکەکانی مندا ئەفسەرەکە وتی: «گەنجە گیان، ئەوەی لە دەستمان بێ دەیکەین، هەمیشەیش ئەوە بزانە ئەم ئیشانە ئەگەر کەسی گەورەتریان لە پشت نەبێت، بە کەسی ئاسایی ناکرێن، ئیتر بۆیە هەوڵ بدە زۆر

لەو ناوە خۆت دەرمەخە، هەوڵ بدە خۆت لە بابەتەکە دوور بخەیتەوە و خۆت نەکەیتە خاوەنی کەیسێکی لەو شێوەیە، چونکە بەم کارەت لەوانەیە خێزانەکەیشت لەناو بەری!»

من، کە ئەفسەرەکە ئەم قسانەی کرد، تووشی شۆک بووم، پێم وا بوو ئەفسەرێکی پۆلیس کە چەکی پێیە و هەیکەلێکی ڕێک و پتەوی هەیە، هەرگیز قسەیەکی وا ناکات و ناڵێت شتێکی لە ئێمە گەورەتر هەیە، بەڵام لە قسەکانییەوە لەوە تێگەیشتم کارەکانی ئەم باندەی من لەگەڵیان تێوەگلاوم، تەنیا لە دەستی چەند هەرزەکارێکی وەک شێنێ و ژنێکی وەک خاوەن ساڵۆنەکەدا نییە، بە دڵنیاییەوە کەسی گەورەتری وای لە پشتە من ناتوانم هیچیان بەرانبەر بکەم. بۆیە دوای ئەو قسانەی ئەفسەرەکە کردنی، لەوە بێهیوا بووم ئەمان بتوانن شتێک بۆ دۆسییەکەمان بکەن، لەوە بێهیوا بووم بتوانم لە ڕێگەیەکی فەرمییەوە تۆڵەی خۆم بکەمەوە، یان هیچ نەبێت لەوە دڵنیا بم جارێکی تر کەس هێرش ناکاتەوە سەرمان!

نەیشدەکرا بەو شێوەیە و بەو بێباکییەی باوکمەوە ژیان بەرێ کەم، بەڵام چیشم لە دەست دێت؟ هەرکەس چیرۆکی ژیانی من بخوێنێتەوە، ڕەنگە پێم بڵێ: «ئاخر تەلەبەیەکی پزیشکی، کوڕی مامۆستایەکی داماو، لەبەرانبەر کاربەدەستان و کەسانی دەوڵەمەندی ئەم شارە چی لە دەست دێ؟ تۆ خۆت لە جێی من دابنێ، ئەگەر بەسەرهاتێ ژیانت خوێندمەوە،

شتەکە بە گاڵتە وەرمەگرە و بۆ ساتێکیش بووە خۆت لە وەها دۆخێکدا وێنا بکە، بزانە چیت پێ دەکرێت!

ئاخر لە بارودۆخێکی لەم شـێوەیەدا مرۆڤ، حەز دەکات سەری خۆی هەڵگرێت و نەگەڕێتەوە ئەو نیشتیمانە، ئاخر کە مرۆڤ هەستی بە بێدەسەڵاتیی خۆی کرد، هەستی بەوە کرد ئەو دەزگایانەی دەبێ بیپارێزن، هەڕەشـەن بۆ سـەری، ئیتر ژیانی لەو شوێنە مانایەکی نامینێت. بۆیە من لەو کاتەوە، هەر لە قۆناغی دووەوە، تۆوی بیرۆکەی ڕۆیشتن و بەجێهێشتنی ئەم وڵاتە لە سەرمدا گەشەی کرد.

تۆوێـک ڕۆژ بە ڕۆژ گەورەتر و گەورەتر دەبوو، ئـاخر مرۆڤ چۆن دەتوانێ ببینێت ئەو کەسـەی هەموو ژیانی بە پـاڵەوانی خۆی دانـاوە، بـاوکی، بە بێدەسـەڵاتی لەبەرانبەر باندێکی مافیاییدا ببینێت؟ زۆر سـەختە... ڕاستییەکەی هەموو خەڵکی ئەم شـارە وان، باوکانیان بە بێدەسـەڵاتی لەبەرانبەر باندێکدا دەبینن، بەڵام ئەوەیە جارێ هەندێک کەس هەسـتیان بەوە نەکردووە و بیریان لێ نەکردۆتەوە، هەر کاتێک بیری لێ بکەنەوە، ڕاسـتەوخۆ بۆیان دەردەکەوێت لە ژینگەیەکی چەند قێزەوندا چاویان بە دنیادا هەڵهێناوە.

چەند مانگێک بەسـەر ئەم ڕووداوانە تێپەڕین، من و ئانیا و دایک و باوکم وردە وردە ڕێڕەوی ئاسـایی ژیانی خۆمانمان وەرگرتەوە و ئـانیـا بۆ یەکەم جـار لە مـاڵی ئێمە ئـاهەنگی

لەدایکبوونی خۆی گێڕا، ئەو کاتەیشـــی مۆمی ســـەر کێکی ڕۆژی لەدایکبوونەکەی خۆی کوژاندەوە، بە دەنگێکی بەرزەوە هیوای خواســـت تا کۆتایی ژیانی لەم ماڵەدا بێت و بتوانێت خزمەتی دایە و بابە بکات و ژیانێکی خۆشـیشـی لەگەڵ مندا هەبێت. ئەو ئاهەنگی ڕۆژی لەدایکبوونەیش یەکێک بوو لە کاتە ناوازەکانی خێزانەکەم، هەر بەڕاستی زۆر دڵم خۆش بوو کاتێک دەمبینی ئانیا بەو شـــێوەیە ڕێزی لە دایک و باوکم دەگرت و ئەوانیش بەو شـــێوەیە پڕ بە چـاویـان پێکەنین و زەردەخەنەی خۆشـەویسـتییان دەبەخشـییەوە، بەڵێ بەڵێ پڕ بە چـاویـان، من پێم وایە هەرچی دەوترێت و نـایشـــوترێ، بەرپرسـی سـەرەکی لێی چاوەکانن، چاوەکان وەک زمان نین، هەرگیزا و هەرگیز درۆ ناکەن، بۆیە من هەر بەڕاسـتی ئاشـقی ئەو زەردەخەنە ڕاســـتەقینانەی دایک و باوکم بووبووم کە بە ڕووی ئانیادا دەیانکرد.

ژیانمان بەو شێوەیە بەردەوام بوو، ژیانێکی ئارام، خەوێکی ئارام، کۆمەڵێک ڕۆژی یەک لە دوای یەکی زۆر ئاسوودە،

لەلایەک چـای دەســـتی دایکم، لەلایەک ئامۆژگارییەکانی باوکم، لەلایەک باوەشـــی گەرمی ئانیا، بەڕاســـتی من هەســـت دەکەم ئەو کاتە لە ئاســـوودەترین کاتەکانی ژیانم ژیاوم، هەر بەڕاستی مرۆڤ کاتێک ئەو هەموو ئاسودەییەی هەیە هەندێک جار گومان لە واقعیبوونی ئەو کاتانە دەکات.

ئاخر منێک کە متمانەی تەواوەتیم بە کچان لە دەست دابوو، ئێستا ئێواران لەناو پارکە گەورەکانی شاردا، لەگەڵ ئانیادا، ڕۆژانی پێنجشەممە و جومعە دەست لەناو دەستی یەک پیاسە دەکەین، پێدەکەنیین، بە مۆبایلەکەی خۆی وێنەی دەگرم، ئەویش وێنە دەگرێت، پێدەکەنێت، هەردووکمان لەسەر چیمەنی پارکەکە دادەنیشین و گۆرانییە خۆشەکانی ئەو لێدەدەین، ئەو زیاتر گوێ لە گۆرانیی عەرەبی دەگرێ، من نازانم بۆ، بەڵام هەمیشە کچان حەز بە گۆرانییە عەرەبییەکان دەکەن، ئیتر منیش ئەم ماوەیە حەزم لێیانە، چونکە ئانیا ئەوەندە بە سۆزەوە بۆ منیان دەڵێتەوە، ئیتر هەموو هەستە خۆشەکان بە یەک جار لە لەشمەوە تیشک دەدەنەوە، جارێک دەڕۆنەوە ناو ناخم و جارێک دەڕۆنە دەرەوە، ئیتر من چۆن لەپاڵ ئەم پەرییە نازدارەدا ئاسوودە نەبم؟!

ئینجا چوونەوەمان بۆ ماڵ و بەخێرهاتنەوە بێکینەکانی دایە و بابە لە هەردووکمان، باوەشە ڕاستەقینە پاکەکەی ئانیا و دایکم، کە هیچ کامیان لە باوەشە درۆیینەکانی ژنانی تر ناچێت، هەر بەڕاستی کاتێک ئانیا باوەش بە دایکمدا دەکا، هەست دەکەم بۆنی دایکی خۆی لێ دەکات و خۆشیدەوێت، بە هەمان شێوە، دایکیشم بۆنی کچە نەبووەکەی لە ئانیادا دۆزیوەتەوە، ئیتر دیارە بۆیە ئەوەندەی خۆشدەوێت.

ئەو ماوەیە، هەموو قسـەکانی باوکم دەربارەی ئەوە بوون مرۆڤی بەندەی خودا، پێویسـتە وەک شـەیتان مامەڵە نەکات، پێویسـتە هەردەم لێبووردە بێت، ئەو هەمیشـە دەیگوت ئێمەی مرۆڤ دەبێ چاو لە خودای خۆمان بکەین، چەند بەخشندەیە، دەبێ خەڵک ببەخشین بۆ ئەوەی ئەویش لێمان خۆش ببێت.

بەڵام ئای، هەموو ئەو ڕۆژە خۆشـانە وەک شـنەبایەک بوون لە مـاڵی ئێمەدا، شـنەیەک بۆنی بـارانی لەگەڵ خۆی دەهێنـا، ڕێـک ئەو بۆنەی بـارانی هەوەڵی پـاییز لە خۆڵی هەڵدەسـتێنێت. ئەو بۆنە بەناو ماڵەکەماندا دەهات و ئێمەش بەدەم پێکەنین و چاخواردنەوەوە چێژمان لێ وەردەگرت، هەر بەڕاستی پڕ بە پێستی وشەی ئاسوودەبوون، ئاسودە بووین.

هەموو ئەو شـنەبا و ئاسـوودەیی و خۆشـییە، لە ماوەی یەک دەقەدا، بە یەک بروسـکەی ناخۆشـی لە گەرووماوە هێنرانەوە دەرێ، لە شـەوێکدا کە لە خۆشـترین شـەوەکانمان بوو، ڕێک لە یادی لەدایکبوونی ئەزیزترین دوو کەسـمدا، هەردووکیـان ٧/١ وەک زۆربەی مـرۆڤە کـۆنەکـانـی ئەم نیشـتیمانە لەدایکبوونیان تۆمار کرابوو، لەو شـەوە گەرمەی هاوینی ئەم شـارەدا، هەموو شـتێک لە زسـتانێکی باراناویی تەمـاویی پڕ پڕ لە بروسـکە و هەورەگرمە دەچوو. من بەتەواوی بیرم نایە چی ڕوویدا، شـتەکان وەک فلاش دێنە بەرچـاوم، بەڵام دڵنیـام یەکێـک دێتە ژوورەوە بە شـەق لە

دەرگـاکە دەدا، دڵنیـام تەنیـا یەک کەس بوو یەک کەس، کەسـێکی زۆر باریک و باڵابەرز، بەبێ ماسـک، بەبێ هیچ شـتێک دێت و دوو گوللە دەنێ بە دایکمەوە و دووان بە بـاوکمەوە و یەکێـک بە ئـانیـاوە، دووانیش بە خۆمەوە، ئیتر هەموو شتێک تەواو!

کە ئاوا دەینووسم، ئەوەندە بەکورتی... هیی ئەوەیە هەموو شـتەکان تەنیا لە ماوەی یەک خولەکدا ڕوویان دا. ئیتر دوور نییە کـاتێ گێڕانەوەکەی دەبیسـتیت و دەیخوێنیتەوە، هیچ کاریگەرییەکی ئەوتۆی لەسـەرت نەبێت، ئاخر خۆیشـم ڕێک لە دوای ئەو گوللانەوە، ڕێـک لە دوای دەنگی ئەو تەقەیەوە هەموو شتێکم لە دەست دا! نازانم، ئێستا خەڵک ببڕن، بکوژن، خەڵکی بمرن، نەمرن، خەڵکی ببینم ئـازار دەچێژن... هەر بەڕاسـتی هەسـتێک لە ناخمەوە دێ و دەڵێ: تۆ، پێویسـتە ئێسـتا بگرییت! پێم دەڵێ: پێویسـتە خەمی ئەو منداڵەت بێت، دەڵێ: دەبێ خەمی خەڵکت بێ... بەڵام لە دوای ئەو شـەوەوە ئیتر شـتێک نەما شـایەنی باس بێت، شـتێک نەما شـایەنی خەفەت بێت، شایەنی پێکەنین یان گریان بێت. بووم بە بەردێک کە نە پێدەکەنێ و نە دەگرییێت، نە هەستی هەیە و نە قسە. نە ڕەفتارم لە هیی مرۆڤ دەچێ و نە گوفتارم، نە دەمەوێ بژیم، نە دەمەوێ بمرم، نەدەمەوێ دەوڵەمەند بم، نە دەمەوێ هەژار بکەوم. نـامەوێ بمێنمەوە و نـاشـمەوێ بڕۆم، نە دەمەوێ

بەردەوام بم لە خوێندن، نە دەمەوێ وازبێنم، نە دەمەوێ لە زیندان بم و نە دەمەوێ ئازاد، ئیتر لێرەوە هەموو شـــتێک لە هیچ دەچێت و هەموو ڕەنگێک بە ڕەش دەبینم....

من دوای ئەو کارەســـاتە، لە هەمان ئەو قاوشـــەی پێشـــتر بەخەبەر هـاتمەوە، بەڵام ئەمجارە کەس بە دیـار ســـەرمەوە نەبوو، ژوورەکەم پڕ بوو لە خەڵکی عەمەلیـاتکراو کە تەنیـا هاواریان دەکرد و دەڕشـانەوە، هیچ شـتێکی تر لەو کەشـەدا نەبوو من هەستی پێ بکەم، کە بەخەبەر هاتمەوە دەگریام، وا دەزانم ئەو کـاتەی لە هۆش خۆیشـــم چووم هەر دەگریـام، چونکە هەر بە گریـانەوە بەخەبەر هـاتمەوە. لەدوای ئەوەی چاوم کردەوە، شـــتەکانم هاتەوە یاد، بیرم کەوتەوە چۆن لە دەقەیەکدا تەواوی خۆشـــی و ئـاســـوودەییەکـانم لە لایـان کەســـێکی لاوازی بـاڵابەرزەوە بە حەوت گوللە کۆتـاییـان پێ هات...

لە دوای بەخەبەرهاتنەوەکەمەوە بۆ یەک دەقەیش لە گریان نەوەســـتام، بەڵام بەبێدەنگی، ئەوەی هەبوو، تەنیا فرمێســـک بوو بە چـاومـدا ڕێگـای خۆی دەدۆزییەوە بۆ ئەوەی بە ڕوومەتمدا بێتە خوارێ، تاکە شت هەستم پێ دەکرد ئەوە بوو فرمێســـکەکـانم زۆر گەرم بوون، کە بە ڕوومەتمـدا دەهـاتنە خوارێ، هەستێکی تایبەتیان پێ دەبەخشیم، وەک ئەوەی هەر دڵۆپێک لە فرمێســـکەکان هـاوار بکا و بڵێ: تۆ نەتوانایت، تۆ

هیچیت، تۆ ژیانت هیچ مانایەکی نەماوە، هەر هیچ شـــتێک نەماوە تۆ بە دونیاوە ببەســـتێتەوە، هەر دڵۆپە فرمێســـکێک کۆمەڵێک قســـەی لەو شـێوەیەی دەکرد. من دەمزانی شـتێک گۆڕاوە، بەڵام نەمدەزانی چ شـــتێکە، ئەوەندەی لە بیرم بێت چەند سەعاتێک دوای بێداربوونەوەم بۆ یەک دەقەیش نەبووە فرمێســـک لە چاوم نەهاتبێتە خوارەوە و ئەو قســـانەی پێ نەوتبم!

دوای ئەو چەند سـەعاتە، پەرسـتارێک هاتە ژوورەوە، هەر کە منی بینی بەخێرایی ڕایکردە دەرەوە، کە هاتەوە دوو کەسی تری لەگەڵ خۆیدا هێنابوو، هەردووکیان جلی مۆدەیان لەبەردا بوو، وامزانی هـاتوون بمکوژن، بەڵام دواتر بۆم دەرکەوت ئەوانە پزیشـــکەکانمن، ئەو پزیشـــکانەی پێنج عەمەلیاتیان بۆ کردبووم تا گوللەکان لە ســـنگ و زگم دەربهێنن، بۆ ئەوەی پێکەوە شـــتەکان تاوتوێ بکەن و من تێیاننەگەم، هەردووکیان بە ئینگلیزی قسـەیان دەکرد، بەڵام من چون قوتابیی پزیشکی بووم ئینگلیزیم دەزانی و تێیـانـدەگەیشـــتم. بۆیە هەموو قسەکانیانم بەتەواوەتی لە بیرە.

پزیشـــکە گەنجترەکە دەیگوت: «دکتۆر، من یەکەم جـارە کەیسێکی لەو شـێوەیە ببینم بتوانێ دوای مانگێک و پاش ئەو هەموو عەمەلیاتە، بەبێ کێشـــە چاوەکانی بکاتەوە، نازانم تۆ پێشـــتر شـتی وات بینیوە؟» ئەویش وەڵامی دەدایەوە: «منیش

یەک جار بۆیان باس کردووم، بەڵام شـتی وام نەبینیوە، ئەوە یەکەم جارە کەسێکی وا ببینم.»

من ئەوکاتە زانیم ماوەیەکی زۆرە لێرە ماومەتەوە و لەو هەموو ماوەیەدا بێهۆش بوومە، ئێستایش لەدوای هۆشهاتنەوەم یەکەم شت کردبێتم گریانێکی دوورودرێژ بووە، دواتریش قسەی ئەم دکتۆرانە... لە دوای قسەکانی ئەوانەوە بۆم دەرکەوت ئەو کەسە لاوازە دوو گووللەی لە منیش داوە.

پێم سەیرە و نازانم کەسێک چۆن دەتوانێ وەک ئەو کوڕە گەنجە باریکەی ئەو شەوە هات و خێزانێکی بەختەوەری گوللەباران کرد، ئازا بێت و ئاوا بێڕەحم بێت! دواکەس کە گوللەکانی پێوە نا، من بووم. بۆ ئەوەی هەموو ئەوانە ببینم. هاواری دایک و باوکم و خۆشەویستەکەم لەپێش چاوی خۆم ببینم، من هەر بیرم لەو شتانە دەکردەوە، کاتێکم زانی یەکێک لە دکتۆرەکان لێم هاتە پێشەوە و وتی: «کاکە، کاکە، دەمبینی؟ گوێت لە دەنگمە؟»

وتم: «یەس دکتۆر، گوێم لێتە.» بەڵام کە من ئەو قسەیەم کرد، دکتۆر هیچ وەڵامێکی بۆ قسەکەم نەبوو، هەر هاواری دەکرد کە ئایا من گوێم لێیەتی؟ دەیبینم یان نا؟ من هەر دەمگوت: «بەڵێ. یەس دکتۆر...» هیچ سوودی نەبوو، ئەو هەر هەمان قسەی دووبارە دەکردەوە، دوای چەند جارێک بۆم

دەرکەوت دکتۆر گوێی لە من نییە، ئەو قسانەی دەیانکەم تەنیا لەناو مێشــکی خۆمـدان، ڕوونیشـــە پزیشــکەکە گوێی لە قســـەکانی ناو مێشــکم نابێت. من نەمدەزانی چۆن بڵێم گوێم لێیەتی، دەمویســـــت هەر جێگـایەکم بجووڵێنم، نەدەجووڵا، هەرچیم دەکرد نەمدەتوانی دەسـتم یان لێوەکانم بجووڵێنم بۆ ئەوەی ئیشـــارەتێکیان بدەمێ کە گوێم لێیانە، لێیان تێدەگەم، منیش دەبم بە پزیشــک... ئاخر دەمویســـت قســـەیان لەگەڵ بکەم، بزانم ئەوانی تر چۆنن؟ لە کوێن؟ چییـان بەســـەردا هاتووە، بۆچی کەسیان لە دەوروبەرم نین؟

دوای ئەوەی هیچ وەڵامێکم پێ نەبوو بۆیان، پزیشـــکەکان ڕۆیشـتن، پێش ئەوەی لە ژوورەکە بچنە دەرەوە پەرسـتارەکە وتی: «دکتۆر، پێی بڵێین خێزانەکەی هەموویـان مردوون یان جارێ پێویست ناکا؟»

دکتۆرەکە وتی: «نـا، جارێ بـا بێتەوە هۆش خۆی و تۆزێ باشــتر بێ ئەوکات هەموو قســەیەکی پێ دەڵێین، جارێ بەس دەرمانەکانی بدەنێ و تەواو.»

ئەوە کۆتا قســـەی ئەو ڕۆژە بوو کە گوێم لێ بوو، ئیتر کە ئەو قســـــانەیـان تەواو کرد، لەپڕ ڕووناکییەکی زۆر لەپێش چاومـدا دروســـــت بوو، بەرچاوم پڕ بوو لە ڕەنگی جیاواز، لەناکاو یەکدنیا دەنگ لەناو گوێمدا هاواریان دەکرد و شــتێکی وەک بروســـکە لەبەر چاوم ڕووناکیی گەورە گەورەی دەدا و

دەکوژایەوە، ڕەنگەکانی ئەو کاتە دەمبینین جۆرێکی سەیر بوون، وەک ئەوە وا بوو هەرگیز ئەو ڕەنگانەم نەبینیبێت، ئەو دەنگانەیشی ئەو کاتە دەمبیستن، هەمووی دەنگی ئامۆژگارییەکانی باوکم و دەنگی دایکم بوو کە قوربانم دەبوو، دەنگی ئانیا بوو لەو کاتانەی دەیگوت تواناکەم، ئەو دەنگە ناسکەی لە کاتی پێکەوەخەوتنماندا بە گوێمیدا دەچپاند... بۆ ساتێک دەنگی غازفرۆشی بەردەرگامان و دەنگی دکتۆرەکانی زانکۆ و هەزاران دەنگی تر تێکەڵ بووبوون، دواتر ئاگام لە هیچ شتێک نەما...

دوای ئەو حاڵەتە سەیر و نامۆیەی وام دەزانی ئەوە مردنە و منیش وا دەمرم، دووبارە بەخەبەر هاتمەوە، ئەمجارە لە بانگی پزیشکێکدا بەخەبەر هاتمەوە کە لەگەڵ دوو پزیشکەکەی تردا دووبارە هاتبوونەوە، ئەم پزیشکەیان دیار بوو پزیشکی شتێکی ترە، چونکە دووانەکەی تر کە عەمەلیاتیان کردبووم لێیان دەپرسی: «دکتۆر، ئەم فێیانە بۆ وا لەناکاو بۆ ئەم کوڕە هاتوون؟ هیچ هۆکارێک هەیە؟» ئەویش دەیگوت: «فەحسەکانی هیچ شتێکمان پیشان نادەن، بەڵام پێویستی بە چاودێریی بەردەوام هەیە، چونکە لەوانەیە ئازاری خۆی بدات، ئەو شێوازە لەناکاوە لە فێ لەوانەیە زیان بە مێشکی بگەیێنێت.» ئەوانیش تەنیا سەریان دەلەقاند، ئەوکاتە دووبارە زانیم کێشەیەکی تریشم بۆ دروست بووە، تەنیا

بەهۆی قســـەکانی ئەوانەوە نا، بەڵکو لەدوای ئەو کاتەوە من شـتەکانم بە جۆرێکی تر دەبینی، هەسـتم دەکرد من شـتەکان جیاوازتر لە خەڵک دەبینم! زۆرم لا سەیر بوو ئەو شتانەی من دەیانبینم ئەوان نایانبینن، ئەو دەنگانەی من گوێم لێیان دەبێ، کەســی تر نـاڵێ چین و گوێی لێیـان نـابێ، من دەمزانی کێشــەیەک لەو خەڵکەدا هەیە، ئاخر چۆن ئەو شــتانە نابینن؟ کەی ماقووڵە گوێیان لەو هەموو هاوارە نەبێ؟ نازانم!

ئەو ڕۆژە، کە پزیشــکە نوێیەکە هاتبووە لام، وتی: «توانا چۆنی؟» وتم: «ســوپاس دکتۆر گیان، من باشــم، تۆ چۆنی؟» یەکێکی تریش لەدوای دکتۆرەکەوە وەڵامی دایەوە: «ئـا، ئـا دکتۆر، زۆر باشە، نایبینی پاڵی داوەتەوە!» کەچی دکتۆر چەند جارێک هەر پرســیارەکەی دووبارە دەکردەوە، نە گوێی لە من بوو و نە لەو پیاوەیشی لە پشتییەوە قسەی دەکرد! زۆرم پێ سەیر بوو، بەڕاستی تا ئێستا شتی وام نەبینیبوو.

ئەو هەنـدێـک شـــتی تریشـــی کرد کە دکتۆرەکـانی تر نەیاندەکرد، هەندێک دەســتی لە قاچم دا و دەیگوت: «هەســت بە دەســـتم دەکەی؟» منیش دەمگوت: «بەڵێ دکتۆر گیـان، هەستی پێ دەکەم.» ئەمجارە منداڵێک سەدرییەی دکتۆرەکەی دەگرت و دەیگوت: «ئـا، ئـا دکتۆر، ئەوەتـا دەڵێ هەســـتی پێ دەکەم.» دکتۆر ســەری دەلەقاند و دەیگوت: «پێناچێ هەســت بە هیچ بکات!» من چاوەکانم زەق دەبوونەوە، چونکە دکتۆر

نە گوێی لە من دەبوو، نە گوێیشـــی لە منـداڵەکە دەبوو. نەمدەزانی چۆن تێیانگەیێنم!

دکتۆرەکان هەر لەوێ بوون، کە باوکم لەپشـــتیانەوە هاتە پێشـــەوە و وتی: «توانا کورِم، چۆنی؟ باشـــی؟» وتم: «باوکە گیاان، بەخێربێی، سـوپاس بۆ خودا کە سـەلامەتی، زۆر باشـم باوکە، بەڵام نازانم ئەو دکتۆرانە بۆ گوێم لێ ناگرن؟!» باوکم دەیگوت: «کورِم، گوێیان لێتە لێ، بەئەنقەست جوابت نادەنەوە، ئەوە ئیمتیحانت دەکەن بزانن دەردەچی؟» باوکم ئەو قسـانەی دەکرد و لە ژوورەکە دەچووە دەرەوە، من هەسـتم دەکرد هەموو قسـەکان بێمانان، دەرکەوتنی باوکم و ئەو پزیشکانە و منداڵەکە و پیاوەکەی پێشـــووتریش و ئیمتیحانات... بۆچی هەموو شـتەکان ئاوا تێکەڵاو بوونە؟ نەمدەزانی بابەتەکە چییە کە پێویستە باس بکرێت، هەموو شتێک ئاڵۆز دەردەکەوت.

چەنـد ڕۆژێـک ئەو شـــتانە دووبـارە بوونەوە، من هیچ هەڵبژاردەیەکم نەبوو جگە لە قبوولکردنیـان، تـا ڕۆژێـک پزیشـــکەکان هەوڵیان دا هەڵم بســـتێننەوە بۆ ئەوەی بە پێی خۆم بڕۆم. منیش ڕۆیشتم، پزیشکەکە دەیگوت: «باشـە مادام دەتوانی بڕۆیـت، بۆچی چەنـد ڕۆژە وەڵامـان نـادەیتەوە؟!» منیش دەمگوت: «دکتۆر گیان، بە خوا وەڵامم دەدایەوە، بەس تۆ گوێت نەدەگرت.» دووبـارە دکتۆر پێ نەدەچوو گوێی لێم بێت یان لە قسـەکانم بگات، بە پزیشـکەکانی تری دەگوت: «بە

خوا یان لە حاڵەتێکی شـۆکدایە یان زمانی لە دەسـت داوە!»
منیش مناقەشـەم لەگەڵی دەکرد و دەمگوت: «دکتۆر، ئاخر من گوێم لێتە و وا وەڵامت دەدەمەوە، بۆچی وەڵامەکانی من بە هەند وەرناگری و گوێم بۆ ناگری؟ زۆر سـەیرم پێت دێ، دکتۆر چۆن وا دەبێت ئاخر؟!»

دوای یەکەم هەستانەوەم لە نەخۆشخانەکە، هەستم بەوە کرد هەر بەڕاسـتی خەڵکەکە هەموویان شـێت بوونە، چونکە کەس وەڵامی کەسـی نەدەدایەوە، کەس گوێی بۆ کەس نەدەگرت، کاتێکیش قسـەت بۆیان دەکرد، دەیانگوت: ئەوە بۆ هیچ قسـە ناکات؟ ڕۆژانە هەر دەهاتم و دەچووم، خۆم بە پێیەکانی خۆم دەڕۆیشتم بۆ ئاودەست، نانم بە دەستەکانی خۆم دەخوارد، هیچ عەیبێکم نەبوو، تاکە کێشـەیەک هەمبوو ئەوە بوو خەڵکەکە هەموویان شێت بووبوون!

ڕۆژێکیان پیاوێکی پیر هاتە ژوورەکەمەوە، سـواڵی دەکرد، دواتر مەلایەک لە پشـتییەوە هات و قسـەیَ ناشـرینی پێ دەگوت، دواتر دکتۆرێک هات و هەردووکیانی لە ژوورەکەم کردە دەرەوە، دواتر باوکم هات و دایکم بەوێدا تێپەڕی، هیچیان قسەیان نەدەکرد، هەندێک جار لەگەڵ یەکتردا بەشەڕ دەهاتن، لەناو خەسـتەخانەکەدا دەیانکردە هەرا، بەڵام کەس قسەی لەگەڵ نەدەکردن، نەخۆشـەکانی تریش هیچ تەماشای دایک و باوکمیان نەدەکرد، دکتۆرەکانیش نەدەهاتن دەریان

بکەن، هەندێک جاریش شتی سەیر و سەمەرە دەهاتنە ئەو نەخۆشخانەیە، جارێکیان پیاوێکم بینی دەستێکی لە سەردا ڕوابوو ، پێم وا بوو هاتبوو بە نەشتەرگەری ئەو دەستەی بۆ لاببەن، بەڵام دکتۆرەکان چوون دەستێکی تریان لەناو چاویەوە دەرهێنا و ئەویش زۆر سوپاسی کردن کە لەو دەستە ڕزگاریان کردووە! ئەو ماوەیە چەندین شتی لەو شێوازەم بینی، کە نەمدەزانی بۆچی جگە لە من، هیچ کام لە نەخۆشەکانی تری ژوورەکە هیچ کاردانەوەیەکیان بۆ ئەو کەیسە سەیرانە نییە! دواتر لە مێشکی خۆمدا دەمگوت، ئیتر ئێرە نەخۆشخانەیە، لەوانەیە هەموو شتێکی لێ بێت، دیارە ئەو خەڵکەیش لەگەڵیدا ڕاهاتوون، بەس من نەمبینیوە بۆیە پێم سەیرە.

ئەو ماوەیەم لەو نەخۆشخانەیە بە ڕێ کرد، ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر دڵم دەگوشرا، نەمدەتوانی خواردنەکانم بخۆم، نەمدەتوانی لە جێگەی خۆم هەستمەوە، هەندێک جاریش فلاشەکان دەهاتنەوە بەرچاوم و لە هۆش خۆم دەچووم. حەزم لە هیچ شتێک نەمابوو، نەمدەویست وەرزش بکەم، نەمدەویست سەیری پەرستارە جوانەکەی نەخۆشخانەکە بکەم، ئەوەی هەموو کات کە دەهاتە ژوورەوە، پێنج کوڕ لە پشتییەوە دەهاتن و سەیری جەستەیان دەکرد، ئینجا لەناو قاوشەکەدا هاواریان دەکرد و دەیانگوت: ئەی بابااا لەو جسمە

چەنـدە جوانە! من پێم دەوتن: وا مەکەن، وا مەکەن، عەیبە چۆن دەبێ شتی وا بڵێن؟! بەڵام نە پەرستارەکە قسەی دەکرد و نە نەخۆشـەکانی تر، پەرسـتارەکە هەر هیچ قسـەیەکی پێ نەدەگوتن، پۆلیسـەکانیش دەریان نەدەکردن، ئەوانیش هەموو ڕۆژ هەمان شتیان دووبارە دەکردەوە.

هەندێک جار بە یەک جار ١٠٠ کەس بۆ سـەردانم دەهاتنە نەخۆشـخانە و گوڵیان بۆ دەهێنام، نازانم چۆن ئەو هەموو خەڵکە جێگەیان دەبۆوە! جاری وا هەبوو لەو ١٠٠ کەسـە ١٠ کەسیان باوکم بوون، پێنجیان دایکم بوون، ١٥ کەسیان ئانیا بوون، جاری وا هەبوو ئەو کەسەی ئەوانیشی کوشت، دەهات و دەمانچەیەکی بە دیاری بۆ دەهێنام، هەموو ئەو شـتانەی نەخۆشـخانەکە سـەیر بوون، نەمدەزانی چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا بکەم، بەڵام هەندێکیان کۆمیدییش بوون، جاری وا هەبوو پێدەکەنیم، هەندێک جاریش دەگریام، بەڵام نە دەمزانی بۆ پێدەکەنم و نە دەیشمزانی بۆ دەگرییەم!

ڕۆژێک پزیشـکەکەی منی هەسـتاندەوە سـەرپێ، لەگەڵ پزیشـکێکی تری کەچەڵ هاتن و سـەیری منیان کرد، پزیشـکە نوێیەکە زۆر زیرەک بوو، زۆر... وتی: «توانا، کە من پرسیارێکم کرد تۆ هەوڵ مەدە قسـە بکەیت، تەنیا بە پەنجەکانت جوابم بدەرەوە، ئەگەر پەنجەت جووڵاند، ئەوە یەعنی بەڵێ، ئەگەر نەتجووڵاند، یەعنی نەخێر، باشـە کوڕم؟» منیش پەنجەم

جووڵاند، مەبەستم ئەوە بوو باشە دکتۆر، ئەو جارە هیچ قسەیەکم نەکرد، چونکە زانیم خەڵکی ناو ئەم نەخۆشخانەیە شێتن و لە قسەکانم تێناگەن، بۆیە بڕیارم دابوو بە پەنجە قسەیان لەگەڵدا بکەم!

دکتۆرەکە وتی: «توانا گیان، تۆ دەزانی لە کوێی؟» منیش پەنجەم جووڵاند.

وتی: «باشە دەزانی چیت بەسەر هاتووە؟» دووبارە پەنجەم جووڵاند.

وتی: «باوکت هاتووە سەردانت بکات؟» دوبارە پەنجەکانم جووڵاند، چونکە زۆربەی ڕۆژەکان باوکم دەهات.

دواتر وتی: «ئەی دەزانی باوک و دایکت و ژنەکەت کوژراون؟» دووبارە پەنجەمم جووڵاند.

وتی: «ئەی باشە دەزانی کەسی مردوو ناتوانێ بێتە سەردانی نەخۆش؟»

کە ئەو پرسیارەی کرد، هیچم نەکرد، پەنجەیشم نەجووڵاند، بەڵام چەند چرکەیەک دوای ئەوە دووبارە ڕووناکییە زۆرەکان و دەنگی کاتی خەوتنی من و ئانیا و دەنگی وتاری جومعە و باوک و دایکم و تەقە و هەزاران دەنگی تر تێکەڵ بوون و... کە هەستامەوە، لە جێیەکی جیاواز بووم، شوێنێکی سپی سپی بوو، بەس منی لێ بوو، لەسەر قەرەوێڵەیەک دانرابووم، نە

کانیولام لە دەست بوو و نە هیچ شتێکی تری لە نەخۆشخانە دەچوو.

دوای ئەوەی بەخەبەر هاتم، ڕاستەوخۆ پەرستارێک هاتە ژوورەوە، پەرستارەکە وتی: «چۆنی؟ باشــی توانا؟» منیش پەنجەم بەرزکردەوە بۆ ئەوەی تێبگات، چونکە وەک وتم هەموویان شێت بووبوون و هیچ کام لەو شتانەیان نەدەبینی وا لە ژوورەکەمدا ڕوویان دەدا. وتی: «ئێ، کە واتە باشــی؟» دووبارە پەنجەم جوڵاندەوە.

وتی: «توانا، تۆ ئێستا پارێزراوی، هیچ خەمت نەبێ، کەس دەستی پێت ناگات، ئەو ژوورەیشمان داوەتە تۆ، تایبەت بە خۆتە، سەیر کە هەموو شتەکانیشمان بۆ سپی کردووی، بۆ ئەوەی دڵت پێیان بکرێتەوە، لێرەوە دەتوانی بێیتە باخچەکە، چەند هاوڕێیەکی تری وەک خۆتی لێیە، دەتوانن لەوێ پێکەوە دابنیشن و قسەکانتان بکەن، دڵنیا بە ئەوان لە تۆ تێدەگەن. ئەوەیش کتێبخانەیە، دەتوانی کتێبەکان بخوێنیتەوە و دەفتەریشی لێیە، دەتوانی لەسەر ئەو مێزە سپییە شتی تێدا بنووسی، شەوانیش زوو بخەوە، لێرە گڵۆپی لێ نییە، بۆیە دوای ئێوارە ژوورەکەت تاریک دەبێ، هەوڵ بدە زوو بخەوە بۆ ئەوەی بەیانیان خۆرهەڵاتن ببینی، دیمەنێکی زۆر ناوازەی هەیە زۆر.»

ئەو قسانەی کرد و ڕۆیشت، من خێرا هەستامەوە بڕۆمەوە ماڵێ، دەموت بۆ لێرە بمێنمەوە؟!

چوومە باخچەکە و سەیرم کرد لە شوێنێکی زۆر بەرزم، وەک بڵێی لەسەر چیایەکم، کە سەیری خوارەوەی چیایەکە دەکەیت، هیچ شتێک دیار نییە جگە لە هەندێک دەشتی زەرد و هەندێک ئاوی زۆر شین و جوان! خەڵکی ناو باخچەکەیش هەموویان جلکی سپییان لەبەردایە، منیش جلەکەم هەر وەک ئەوەی ئەوانە، ئەوانەی لێرە لەو باخچەیەن من و ١٠ کەسی ترین، ٨ کەسیان کچن و من و دوو کوڕی تری لێیە، کەسیان قسە ناکەن، ئەوەندەی سەیریان دەکەم، ئەوانیش سەیرم دەکەنەوە، بێ ئەوەی هیچ قسەیەک بکەین، جاری وایە لەسەر هەمان کورسی دادەنیشین، بەڵام بەر یەکتر ناکەوین و لەگەڵ یەکیشدا قسە ناکەین! هەموو بەیانیان پەرستارە باشەکە دێت و هەندێک حەبم دەداتێ، شەوانیش دێت حەبێکم دەداتێ کە دوای خواردنی، یەکسەر خەوم لێ دەکەوێت.

نازانم ئێرە چییە؟ لە کوێم؟ بەڵام ئەوەندە دەزانم ئێستا ماوەیەکە فلاشەکانم نەماون، نایشزانم ساڵی چەندە و چەند ڕۆژە لێرەم، بەڵام هەست دەکەم شوێنێکی خۆشە، بۆیە ناوم لێ ناوە (زیندانە سپییەکە)، لەو ڕۆژەوەی پەرستارەکە ئەو قسانەی پێ وتم و ژوورە خۆشەکەی پێ دام، بڕیارم دا ئەو شتانەی لە بیرم ماون، بنووسمەوە و بیاندەم بە پەرستارەکە،

تا ئێرەم بیرە چی ڕوویداوە، ئەو شتانەی ئێستا دەیانبینم زۆر سەیرن، هەست دەکەم ئاژەڵی ئەو شاخە بەرزەن کە ئێمەی لەسەرە، هەندێک جار دەبینم شتی زۆر گەورەی شین کە لە حووت دەچن، وەک ئەوەی لەناو ئاودابن بە ئاسماندا دەفڕن! هەندێک جار کۆمەڵێک بۆق دەبینم ملیان هیی نەعامەیە و سەری نەعامەیان پێوەیە، هەندێک جاری تر دەبینم بزنێکی ڕەش دێت، سەری مانگای پێوەیە، جا چونکە سەری مانگاکە زۆر گەورەیە ناتوانێت بە ڕێگادا بڕوا، بەردەوام پاڵی داوەتەوە! هەندێک جار دەبینم ئانیا لێرەیە، ئەو ڕۆژانەی ئەو دێت، لە ژوورەکەمدا بەیەکەوە خۆمان ڕووت دەکەینەوە، سەیری یەکتری دەکەین، بەڵام نازانم بۆ، نە ئانیا دێتە پێشەوە و نە من دەچمە پێشەوە، تەنها سەیری یەکتر دەکەین، کە پەرستارەکەیش دێتە ژوورەوە و دەبینێت ڕووتم، خێرا هاوار دەکات و دێن دەرزییەکم لێ دەدەن و ئانیا لە ژوورەکە ون دەبێت و منیش خەوم لێ دەکەوێتەوە، هەموو شتێک بۆ بەیانی ئاسایی دەبێتەوە و پەرستارەکە هاوار ناکات و منیش جلم لەبەردایە. هەرچۆنێک بێت، هیوادارم ئەو ڕۆژەی پەرستارەکە ئەم کتێبە دەدات بە خەڵک، خەڵکێکی زۆر بیخوێننەوە، هەر کاتێکیش کەسێکیان خوێندیانەوە، بیدەن بە ١٠ کەسی تر تا ئەوانیش بیخوێننەوە، بۆ ئەوەی ئەگەر ڕۆژێک هات کەسێک زانی ئەو شاخە بەرزەی منی لێم کوێیە،

بێت و دەرم بێنێت، چونکە زۆر بیری شــێنێ دەکەم، دەمەوێ بزانم ئەمڕۆ سناپی بۆ کردووم یان نا...

هەندێکجار تەنیا نەخواردنەوەی چایەکی دەستی دایکت، تا کۆتایی تەمەنت گەورەترین پەشیمانیی لە دوا دەبێت... دواجار ناتوانیت هیچ شتێکیش لە بارەیەوە بکەیت.

٤٠٠٠ دینار

ISBN:978_9922_646_60_2